# کورتەی ژیان و بەرهەمەکانی شەهید عەبدولخالق مەعروف

میژووی هەر نەتەوەیەك کۆمەڵێك ناوی گەشاوەو دیاری تێدا دەردەکەوێت کە هەریەکە لە بوارێکی تایبەتدا جێگادەستی خۆیان لە مێژووی ئەو کۆمەڵەدا دیاریدەکەن، بە گوێرەی مێژووی کوردیش ئەو ناوە دیارو درەوشاوانە گەلێکن کە سەرباری بارودۆخی ناهەمواری کوردستان لە مێژووی دوورودرێژی ڕابردوودا ئەمان جێگای دیاریان گرتووەو ناشێت لە یادوەری نەوەکانی ئێستاو داهاتووشدا ناویان لەیاد بچێتەوە. یەکێك لەو ناوە گەشاوانەی مێژووی کورد، کە بە شەهیدی قەڵەم حساب دەکرێت، شەهید عەبدولخالق مەعروفە. ڕاستە کورد لە مێژووی خەباتی خۆیدا بۆ ئازادی گەلێك شەهیدی داوە بەڵام شەهید عەبدولخالق سەرباری ئەوەی کە کەسێتێکی نیشتمانپەروەرو داکۆکیکەرێکی جەسووری مافە ڕەواکانی کورد بوو، هەروەها قەڵەمێکی زانستیو داواکارێکی مافە ڕاستەقینەکانی مرۆڤ بوو، لەو ڕوانگەیەوە کە وایدەبینێ دەبێ مرۆڤ پێش هەموو شتێ وەکو مرۆڤ سەیربکرێت و ئەو ئازادیانەی، کە بەرهەمی عەقڵی خۆین و بە دەستی هێناون، نابێت بە هیچ جۆرێك لێی داگیرکبرێت.

شەهید عەبدولخالق مەعروف لە ڕۆژی 1935/1/1 لە ناحیەی کەندیناوەی سەر بە شاری هەولێر لە بنەماڵەیەکی ئایینی هاتۆتە دنیاوە. باوکی مەلایەکی دیاری ناوچەکە بوو، پیاوێکی ئازاو قسەخۆش بوو، خاوەنی بیروباوەڕی نیشتمان بوو. شەهید قۆناغی منداڵی هەر لەوێ بەسەربردووەو ساڵی 1944 لە هەمان شوێن خراوتە بەر خوێندن و تا پۆلی پێنجەمی



سەرەتایی خوێندوە، قسەیەکیش هەیە کە ماوەیەك لە عەوینە خوێندویەتی، لە ماڵی مەلا عەبدوڵاو ئەو کاتەی ماڵیان لە سەید ئەمینی نزیك عەوێنە بووە. هەروەکو مامۆستا مەلا محەمەد ئیسماعیل لە وتاری یادی شەهیدبوونی عەبدولخالقدا وتی، پاشان باوکی لە قوتابخانە دەریدەهێنێت و دەیخاتە بەر خوێندنی ئایینیو ئەمجارە ڕێگای حوجرەو لای مەلاکان دەگرێتەبەر بەشە سەرەتاییەکانی خوێندنی ئایینی لە کەندیناواو ناوچەکانی دەوروبەری تەواودەکات. پاش ماوەیەك لەگەڵ کۆمەڵێك لە فەقێکانی کەندیناواو شاری هەولێر، شەهید عەبدولخالق نزیکەی دووسەد ئیمزایان کۆکردەوەو وەکو داواکارییەك خستیانە بەردەم خوێندنگەی ئایینی، هەتا بە شێوەیەکی ڕەسمی ئەو خوێندنگایەیان بۆ بکرێتەوەو لە بری گەڕان بە دوای حوجرەو مەلاکاندا، خوێندکاری بواری ئایینی ڕووبکاتە خوێندنگایەکی ڕەسمی، هەر لەوکاتەوە دەردەکەوێت کە شەهید عەبدولخالق عەقڵی بەلای کاری دامەزراوەیدا چووەو ویستوویەتی شتەکان لە سنووری بڕیارو یاساو پرینسیپی ئیداری دیاریکراودا ڕێکبخرێن.

ئەم داواکارییەی شەهید عەبدولخالق و فەقێکانی تر بووە هۆی ناڕەزایی زۆرێك لە مەلاکانی ئەو کاتەو، ئەو داواکارییەیان وەکو هەوڵێك بۆ بێکارکردنی خۆیان لێکدەدایەوە، بۆیە دەستەیەکی هەڵبژاردەیان بۆ ڕێگاگرتن لە جێبەجێکردنی ئەو داوایەی فەقێکان سەردانی پارێزگاری ئەو دەمەی هەولێریان کردو هەوڵیاندا پارێزگار ڕازیبکەن بۆ ئەوەی داوای فەقێکان ڕەتبکاتەوە، کاتێ شەهید عەبدولخالق مەعروف ئەم هەوڵەی مەلاکانی بۆ دەرکەوت، خۆی کە هێشتا لە تەمەنی مێردمنداڵیدا بوو سەردانی پارێزگار ئیسماعیل حەقی کردو لە بارەی داواکارییەکەیانەوە بۆی دواو گیروگرفتی فەقێکانی بۆ ڕوونکردەوە، کە چۆن لە ڕێگای حوجرەکان و گەڕان بەدوای مەلاکاندا دووچاری ناڕەحەتی دەبن، پارێزگار کاتێ گوێی لە شەهید عەبدولخالق گرت، داواکەیانی بە ڕەوا زانیو پشتگیری لێکردن. بێگومان ئەوەش لە ئەنجامی زیرەکیو لێهاتوویی شەهید عەبدولخالقەوە بوو بۆ چۆنێتی خستنەڕووی مەسەلەکەو شێوازی قسەکردنی بۆ قەناعەتهێنان بە پارێزگار.

دوای ئەوەی کە شەهید عەبدولخالق زانستە ئایینییەکانی خوێندو گەیشتە ئاستێکی دیاری شارەزایی لەو بوارەدا، بڕیاری دا بچێت بۆ میسر بۆ ئەوەی لە زانکۆی ئەزهەر درێژە بە خوێندن بدات، لە ڕۆژی 1954/4/2دا، کە تەمەنی نۆزدە ساڵان بوو، چوو بۆ میسرو داواکاری پێشکەش بەو زانکۆیە کرد، بەڵام بە بیانووی نەبوونی بڕوانامەی ڕەسمی دان پێدانراو داواکەی پشتگوێ خراو هەلی خوێندنی لەو زانکۆیە بۆ نەڕەخسا، لەبەرئەوە بە ناچاری گەڕایەوە بۆ هەولێرو پاشان چووە بەغداو لەوێ لەلای مامۆستایان محەمەد قزڵجیو عەلادین سەجادی.. دەستیکردەوە بە خوێندن.

لە پاش ماوەی دووساڵ درێژەدان بە خوێندن لە مانگی نیسانی 1956دا، شەهید عەبدولخالق بەشداری تاقیکردنەوەیەکی کرد کە بۆ ئیمام تابوری بوو، لەو تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتنی بەدەستهێناو بوو بە ئیمام تابور لە سوپای عێراقدا. هەر لە هەمان کاتدا هەست و هۆشیاری نەتەوایەتی ئەم پیاوە نەمرە بەرەو پەرەسەندن دەچوو، هەر لەو ساڵەدا بوو بە ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان و درێژەی بە خەباتی کوردایەتی خۆی دا لە ڕیزی ئەو پارتەداو گەلێك کاری گرنگ و پڕ بایەخیشی بۆ بزوتنەوەی کوردایەتی ئەنجامداوە، ماوەیەکی زۆر شەهید ساڵح یوسفی لە ماڵی ئەواندا ژیاوە، ئەوکاتەی لێپرسراوی لقی (5) بوو لە سەردەمی خەباتی نهێنی.

شەهید عەبدولخالق هەر لە تەمەنی لاوێتییەوە ئارەزووی زانست و زانیاری هەبوو. لە ساڵی 1957دا دەستیدایە دروستکردنی جۆرێك لە ئێزگەی ڕادیۆو لەم کارەشیدا بەردەوامبوو هەتا لە ساڵی 1960دا، کە ئەوکاتە لە بەغدا نیشتەجێ بوو، ئێزگەیەکی دروستکرد، لە کاتی ئیشپێکردنی ئێزگەکەیدا لە ڕێگای بەکارهێنانی ڕادیۆیەکی بچووکەوە ئەو مەودایەی تاقیدەکردەوە کە ڕادیۆکە دەیگەیشتێ.

لە ساڵی 1963دا، شەهید عەبدولخالق بەغدای بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ هەولێر، پاشان لە کۆیە پەیوەندی کرد بە شۆڕشی کوردەوەو لەوێش کەڵکیان لە تواناو شارەزاییەکەی وەرگرت بۆ دامەزراندنی ئێزگەی شۆڕش، کە یەکەمجار لە ئەشکەوتی (ڕەش) لە ناوچەی (ژاژڵە) ئەو ئێزگەیە دانراو شەهید عەبدولخالق خۆی بەرپرس و سەرپەرشتیاری کاروباری تەکنیکیو هونەری ئەو ئێزگەیە بوو.

لە ساڵی 1967دا، لە کاتی گفتوگۆی نێوان حکومەت و شۆڕشی ئەیلولدا، شەهید عەبدولخالق کرا بە بەڕێوەبەری گومرگی قەزای دوکان، لە کاتی بەرەو بە بنبەست گەیشتنی گفتوگۆدا،

شەهید عەبدولخالق لە لایەن ڕژێمەوە دەستگیرکراو ڕەوانەی بەندیخانەی بەغدا کراو لەوێشەوە گواسترایەوە بۆ موسڵ، پاشان بارزانی بروسکەیەکی توندی بۆ حکومەت ناردو داوای ئازادکردنی کرد. هەر کە ئازادکرا، بەزوویی پەیوەندی کردەوە بە شۆڕشەوە.

دوای ڕاگەیاندنی ڕێکەوتننامەی ئازاری1970 لە نێوان حکومەت و شۆڕشدا، شەهید عەبدولخالق گەڕایەوە بۆ هەولێر لە 1971/5/1دا شۆڕش ناردیە دەرەوە بۆ چیکوسلوفاکیا بە مەبەستی خوێندن لە بواری ئامێرو ئامرازە ئەلکترۆنیەکاندا لە کۆمپانیای (تیسلا). نزیکەی ساڵێك لەوێ مایەوەو بڕوانامەی دیبلۆمی لەو بوارەدا وەرگرت.

کە شەڕی نێوان شۆڕشی کوردو حکومەت دەستییێکردەوە شەهید عەبدولخالق چووە چیاو لە ڕاگەیاندنی شۆڕش و بە تایبەتی لە کاروباری ئێزگەی شۆڕش کاریکرد. دوای هەرەس گەڕایەوە هەولێرو پاش ماوەیەك سەفەری ئەوروپای کرد.

لە ساڵی 1976دا لە هەولێر دوکانێکی بۆ کاروباری تەکنیکی کردەوەو وەکالەتی ئەجهیزەی دەقیقەی وەرگرت. لە لایەك خەریکی کاروباری تەکنیکیو زانستی دەبوو لە دوکانەکەیدا، لە لایەکی تریشەوە ئەم دوکانەی کردبووە جێگای کۆبوونەوەی ڕۆشنبیران و نووسەران و بەردەوام دوکانەکەی جێگای گفتوگۆی ڕۆشنبیریو ئەدەبیو سیاسی بوو.

شەهید عەبدولخالق، جگە لە بواری زانستی، ڕۆشنبیرێکی خاوەن قەڵەم بوو، جگە لە زمانی عەرەبی، بە باشی خۆی فێر زمانی ئینگلیزی کردبوو، ئەوەش یارمەتیەکی باشی دابوو لە بواری نووسینی زانستیدا. شەهید عەبدولخالق خاوەنی سامانێکی زانستی دەوڵەمەند بوو، لەو کەسە دەگمەنانەی کوردیش بوو کە دەیتوانی بە زمانی کوردی ئەو زانیارییانەی خۆی دابڕژێرێت و بیانخاتە بەرچاوی خوێنەرانی کورد.

شەهید عەبدولخالق لە بواری ئەدەبیشدا شارەزاییەکی باشی هەبوو بە تایبەتی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، هەر لەو بوارەدا کتێبێکی لەسەر ئەو ڕاوبۆچونانە نووسیووە کە پێشتر لەسەر دیوانی نالی نووسراون.

لە بواری کۆمەڵایەتیشدا ڕوانینێکی وردی هەبوو، بە ئاشکرا جیاوازیو نایەکسانی نێوان چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکان و نێوان ژن و پیاوی دەبینی، ئەم ڕوانینەی خۆی سەبارەت بە شوێنی ژن لە ڕوانگەی ئیسلامەوە لە دووتوێی کتێبێکدا کۆکردەوە، کە شارەزاییبونی لە بواری شەریعەتی ئیسلامدا یارمەتی زۆری دابوو بۆ لێکدانەوەو ڕاڤەکردنی ئەو ئایەتانەی قورئان کە پەیوەندییان بە ژنەوە هەیە. پێش شەهیدکردنی ئەم کتێبەی بە ناونیشانی (ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردی"دا بە چاپگەیاند. ئەم کتێبە بووە مایەی نیگەرانبوونی زۆرێك لە دواکەوتوان و کۆنەپەرستان و هەندێکیان بە دەرچوون لە سنووری ئیسلام لێکیان دەدایەوەو نووسەرەکەیشیان بە دژی ئایین ناودەبرد. هەر ئەم کتێبە بووە هۆی سەرەکی شەهیدکردنی ئەم قەڵەمە دیارەی کورد.

عەبدولخالق مەعروف لە پاش نیوەڕۆی ڕۆژی 1985/4/10دا لە کارێکی دژ بە هەموو دابونەریتێکی مرۆڤانەو ئایینیانەدا لە نزیك ماڵەکەی خۆی لە گەڕەکی ئازادی لە شاری هەولێر شەهیدکرا. شەهیدکردنی عەبدولخالق مەعروف کارێکی هێندە دزێوو ناشیرین بوو سەرجەم کۆمەڵانی خەڵك بە گشتیو قەڵەم بەدەستانی کوردی بە تایبەتی نیگەران و خەمبارکردو هەواڵی ئەم کارە تیرۆریستیە بە هەموو کوردستاندا بڵاوبووەو وەکو کارێکی زۆر ناهەموار دژ بە قەڵەمێکی نیشتمانپەروەری کورد لێکدەدرایەوە. لە چلەی ماتەمینی شەهید عەبدولخالق مەعروفدا هەڤاڵ مام جەلال وتارێکی پڕبایەخی خوێندەوە کە تیایدا باسی هەڵوێستی زانستیو نیشتمانی و نەتەوەیی شەهید عەبدولخالقی کردو وەکو قەڵەمێکی بوێرو تێکۆشەرێکی کۆڵنەدەرو ئازادیخوایەکی جەسووری دایە قەڵەم و دەڵێت: "عەبدولخالق مەعروف پیاوێکی دڵسۆز بوو، خاوەنی ڕاو هەڵوێست بوو، زیاتر لە سی ساڵ خەباتی کرد، دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول چوو بۆ ئەوروپاو بەشدرای پێکهێنانی لیژنەی ئەوروپای یەکێتی نیشتمانی کوردستانی کرد. پاش گەڕانەوەشی بۆ هەولێر هەر بە دڵسۆزی مایەوە بۆ شۆڕش. ژیانی عەبدولخالق مەعروف ژیانێکی شۆڕشگێڕانە بوو، هەمیشە دڵسۆز بوو بۆ کوردو کوردستان.." بەمجۆرە هەڤاڵ مام جەلال شەهیدکردنی عەبدولخالق مەعروفی وەکو زیانێکی گەورە بۆ میللەتەکەمان لێکدایەوەو بکوژانیشی ڕسواکرد.

شەهید عەبدولخالق مەعروف لە ڕیزی پێشەوەی شەهیدانی قەڵەمی مێژووی ئێمەدا ناوێکی درەوشایەوەو هەڵوێست و کارو بەرهەمەکانی ناسنامەی نەمرییان پێ بەخشیووەو لە مێژووی داهاتووی ئێمەدا ناوی شەهید عەبدولخالق و شەهیدەکانی تری قەڵەم هاوشان لەگەڵ ناوی سەرجەم شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردستاندا بە گەشاوەیی دەمێننەوە.

شەهید عەبدولخالق مەعروف لە دوای خۆی کۆمەڵێ بەرهەمی بە نرخی بۆ کتێبخانەی کوردی بەجێهێشتووە کە بریتین لە:

1–**ئەنتینا کە کتێبێکی زانستی تەکنیکییە لە ساڵی** 1977**دا بە چاپی گەیاندووە.**

2–**تەکنیکار کتێبێکی زانستی تەکنیکییە لە ساڵی** 1981**دا بە چاپی گەیاندووە.**

3–**دیوانی نالیو کێ ڕاستە، کتێبێکی لێکۆڵینەوەیە لە ساڵی** 1984**دا بە چاپی گەیاندووە.**

4–**ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا. لێکۆڵینەوەیە لە ساڵی** 1984 **بە چاپی گەیاندووە.**

5–**اجهزە الارسال زانستی تەکنیکییە بە زمانی عەرەبی لە ساڵی** 1979**دا بە چاپی گەیاندووە.**

# ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا

## دەربارەی ژن و پیاو

نووسینی

عەبدولخالق مەعروف

هەندێ لە نوسەرو چیرۆکنوسەکان دەڵێن (ژن و پیاو یا- نێرومێ- وەك یەکن بێ هیچ جیاوازیەك، تەنها ئەوەندە نەبێت کە هەریەکەیان کەسێکی ترەو بە لەش لێك جیاوازن، دەنا لە مافی مرۆڤایەتیو ئینسانیدا وەك یەكو یەکسانن).

یەکێك لە نووسەرەکان دەڵێت (ئەمن باوەڕم وایە جوداوازیەك لە نێوان ژنو پیاودا لە ڕووی ئینسانییەوە نییە. بێگومان ئەمە وا ناگەیەنێ کە هەریەکەیان وێنەی کۆپی ئەوی دیکەیانە، بەڵکو هەریەکەیان تەواوکەرو پاڵپشتی ئەوی دیکەیانە).

منیش بۆ خۆم دژی مافی ئافرەت نیم، بەڵکو لەو کەسانەم کە حەز لە مافی ئافرەت دەکەن، بە جۆرێك "کە هەر کردارێكو ڕفتارێك هەیە ئەگەر بۆ لاییێکیان دروستو ڕەوابێ، دەبێ بۆ لاکەی تریش دروستو ڕەوابێ، بە بێ لەبەرچاوگرتنی- مێیایەتیو نێرایەتی- وەك دووتای هاوسەنگ" نەوەك ئەوانەی کە تەنها بە زارو بە نووسینی ناو چیرۆکەکەیان دان بە مافی ژندا دەنێنو بۆی دەپارێنەوەو لە دەرەوەی بیرو نووسین بە کردەوەو ڕەفتاری ڕۆژانەیان دژی مافی ئافرەتنو، بە هیچ جۆرێك بیرو کردەوەیان وێك ناکەون.

بەلای منەوە مافی ژنو یەکسانی لەگەڵ پیاودا هەر ئەوە نییە کاری ناوماڵو منداڵ بەخێوکردنی لێ بسەنرێتەوەو چەکوشو داسو دەستەندوی جووتی بدرێتە دەستو بکرێ بە کرێکارو سەپان و جووتیارو لە کارگەو مەزراکاندا بڕەتێنرێ، یا تیروکەوانو تفەنگی لە مل بکرێو ڕەوانەی کۆڕی شەڕێ بکرێ، یان کاغەزو قەڵەمی لەبەردەم دابنرێو لەسەر سەکۆی فەرمانڕەوایيو فەرمانبەری جێگیر بکرێ. بەڵکو مافی یەکسانی ئەوەیە "کە ئەوەی خواستو ویستو ئارەزووی هەرلایە لە نێرو مێ- ئەگەر بۆ لاییێکیان دروستو ڕەوا بێ بۆ لاکەی تریش دروستو ڕەوابێ بەبێ لەبەرچاوگرتنی مێیایەتی یان نێرایەتی" ئەمەیە مافی مرۆڤایەتیو ئینسانی ئەگەر خۆمان نەخەڵەتێنینو ڕێڕەوێکی تایبەتی گرتووەو تێڕوانینێکی تایبەتی هەیە.

ماف ئاوایە، دەنا ئەویتر وەك لە کارگە ئیش پێکردنو کردنی ژن بە وەرزێرو سەپانو شتی تر لەم بابەتەو کردنی بە هاواتی پیاو لە ڕووی کارەوە ئەمە پێی ناگوترێ ماف. بەڵکو ئەمە چەوساندنەوەی ژنە، چونکە بارەکەی گرانتر دەبێ وێڕای کاری ماڵو بەخێوکردنی منداڵو



- ژنی بەدبەخت هەتا بۆ ئازادیو مافەکەشی چەوساوەی بیری پیاوەو لێی ناگەڕێن بۆ خۆی بیری لێبکاتەوە
- ئەوانەی دەیانەوێ مافی ئافرەت بدەنو ئازادی پێببەخشن، بۆچی لە چیرۆکەکانیاندا کارێکی وا ناکەن کە جیاوازی لە نێوان نێرو مێ نەمێنێ؟

چێشتکەری مێرد، کاری دەرەوەیشی دەخرێتە سەرشان وەك ئەمڕۆ وا بەدیدەکرێ.

هەندێ نووسەری تر دەڵێن (ژن ئازاد نابێو مافی وەگیر ناکەوێ تا خۆی نەبێتە خاوەن پارەو پوول) هەندێکی دیکە دەڵێن (تەنها پارە بەدەست بوونو بە ئارەزووی خۆ شووکردنو بوون بە کارگەی منداڵ دروستکردنی ئازادی ژنو مافی چنگ ناخا، تەنها ڕێگە بۆ ئازادی ژن کارو کارگەیە). سەیر لێرەدا ئەوەیە: ژنان بۆ خۆیان مافی خۆیان دیارینەکردووە کە چییەو چۆنەو دەبێ چ بکەن؟ دیسان هەر پیاوە خۆی لێ کردوون بە کوێخاو مافیان بۆ دیاریدەکاو سنووری مافیان بۆ دادەنێو نەخشەی دەکێشێ.

با ئەو مامۆستا بەرەوانیکەرانەی مافی ژن واز لە ژنان بێننو ژنان خۆیان مافی خۆیان دیاربکەنو خواستو ئارەزوویان لە ماف چییە بیڵێن.

ژنی بەدبەخت هەتا بۆ ئازادیو مافەکەشی چەوساوەی بیری پیاوەو لێی ناگەڕێن بۆ خۆی بیری لێبکاتەوە، پیاو قوت دەبنەوەو لە جیاتی ئەوان بیریان بۆ دەکەنەوەو دەیانەوێ بە ناوی ئازادیو مافی ژن ڕەوانەی کارگەو مەزرایان بکەنو بارەکەیان چەندە هێندەی تریش قورس بکەن. ئایا ئەمە مافدانە بە ژن؟ ئەمە خۆشەویستی ژنو ڕێزگرتنیەتی؟ یا ئەمە بارسوك کردنی پیاوەو دەیەوی لە جیاتی خۆی ژن بڕەتێنێ. لەم سەردەمەشدا ئەو مامۆستایانەی کە لە ماڵەوە لە جیاتی ژنەکانیان بەکاروبار هەڵدەستن، گاڵتەوگەمە بە یەکتری دەکەنو دەڵێن ئایا لە جیاتی ژنەکەی جلی شۆردووە یا قاپو ئامانی خاوێن کردوەتەوەو ناوماڵی ڕێکخستووەو چێشتی لێناوە؟

ئەوجار ئەگەر وەك ئەوانە کە گوایا لایەنگری ژن دەکەنو دەڵێن "دەبێ ژن وەك پیاو تەماشا بکرێ" ئایا ئەوانە خۆیان بە یەك چاو تەماشای، پیاوی چاو لەدەرو ژنی چاو لەدەر دەکەن؟! یان ئەوانە ڕێگەدەدەن ئەگەر پیاوێك دووژن پێکەوە بێنێ ژنێکیش دوو مێردی هەبێ لە یەك کاتدا؟.. با ئەوانە خۆیان وەڵام بدەنەوە.

ڕەنگە زۆر خوێندەوار بیستبیان کە بە تەوسۆ توانج دەڵێن "فلانە ژن نۆ مێردی کردووە" ئەمەش لە کاتێکدا کە تەڵاق درابێ یا مێردی تری کردبێتەوە، بەڵام ئەگەر پیاوێك سەد ژنیشی هێنابێ یەکەیەکە یان چوار چوار، کەس ورتەی لە دەم نایەتەدەرو نەهاتووەتە دەرو بە کارێکی ڕەوا دەژمێردرێ.

ئەنجا ئەگەر ئەوانەی دەیانەوێ مافی ئافرەت بدەنو ئازادی پێببەخشن، بۆچی لە چیرۆکەکانیاندا کارێکی وا ناکەن کە جیاوازی لە نێوان نێرو مێ نەمێنێ؟ بەڵکو بە پێچەوانە ئەوانە لەناو چیرۆکەکانیشدا ئەم جیاوازییەیان پتەوتر کردوە، وەك لە چیرۆکی دەرەبەگ "دەرەبەگ بە زۆری ئارەزووی خۆی لە کچەلادێدا دادەمرکێنێو کچەش بۆ ئەوەی پارێزگاری لە شەرەفو ناموسی خۆیو خێزانی بکا خۆی دەکوژێ" ئەگەر نێرو مێیان وەك یەك تەماشا کردووە، بۆچی دەبێت شەرەفو ناموسی مێ ناولەشی بێ؟. ئەدی بۆچی شەرەفو ناموسی نێر ناولەشی نەبێ؟ دیسان بۆچی هەر ژنەو کراوە بە پێناوی پیاوو کاری خراپەی پێ سپێردراوە؟ ئەوجار هەر خۆیانو ئەوانەی لایەنگری مافی ئافرەتن لە کاتی تووڕەبووندا ئەندامی نێرینەی لەشی خۆیان دەکەنە شمشێرو بە قسە دەینێرن بۆ ناوگەڵی ژن، ژنیش دەبێ بەمە چاوشۆڕبێو ورتەی پێ نەکرێ نێریش وەك کەڵی بەهار بەمە زۆر دڵخۆش بێو شانازی بکا.

دیسان پرسیار لەو چیرۆکنووسو مافخوازانەی ژن دەکەم کە دەیانەوێ ژنی خەڵکی مافو ئازادی وەرگرێو دووربێ لە هەموو چەوساندنەوەیەكو ڕێگرتنێكو بەرهەڵستیەك. ئایا بۆ ژنانی خۆیان ئەو مافو ئازادیە پەسەند دەکەن؟ یا بڵێم ئەم مافو ئازادییەیان بۆ ژنانی سەربەخۆیان دابین کردووە؟ ئەگەر لە وەڵامدا دەڵێن بەڵی، ئەدی بۆچی لە پاشملەی ژنەکانیانەوە هەوەسبازی دەکەنو دەیانەوێ ئەو ژنانەی کە تا ئەمڕۆ بۆیان دەپاڕانەوەو بەزەیی خەڵکیان بۆ ڕادەکێشان بیانخەنە ناو داوی داوێن پیسی خۆیان؟

بۆچی ئەو پیاوە مافخوازانە جێگەی خۆیانو ماڵو داراییانو شاعیریو زاناییانو چیرۆکنووسیو شانۆگەریان، خۆلاسە هەرچی لە دەستۆ مستییان دێ دەیکەنە پردی ئازادیو بەهەشت، بۆ ئەوەی پەرپی ژنی تێبخەن؟ دیسان ئەو ئەوینو عیشقە خوداییە بێگەردەی ئەوان باسی لێوەدەکەن، لە کوێیە؟.. لە دڵی کام مردوو

نووستووه؟ ئەگەر وایە ئەو ئەوینە خاوێنە بێگەردە دوور لە نێرو مێ خوازییە بۆ لەگەڵ دایکی شیردەرو بەخێوکەرو باوکی پەنادەرو بەرێوەبەر، نییە؟ ئەدی بۆچی کە ئەویندارێ بێگەردی مرۆڤانی پیر دەبێ، یا هەر پاش ماوەیەك لە یەکتری تێردەبن، ئەوین وەك پەپولەی بەهەشت دەفڕێو ماڵی پڕ لە ئەوینی خودایی دەبێتە دۆزەخ و نارێکیو گلەو گازاندە؟

لێرەدا باس باسی مافی مرۆڤایەتیە، نازانم بەلای چیرۆکنووس و مافخوازانی ژن پیاوی پیر مافی نییە؟ ئەگەر بە مرۆڤی دەزانن بۆ دەبێ ئاوا باسی کچێك بکرێ کە چەند ستەمی لێکراوە. ئەوەتا ئاسمان و زەوی شین دەگێڕن قوڕ دەپێون چونکە کچێکی ناسكو تەڕو جحێڵ دراوە بە پیاوێکی پیری کەنەفتە، وەها دەریدەبڕن کە پیاوی پیری کەنەفتە دڕندەیەکی ئینسان خۆرە. لەبەرچی؟. هەر لەبەر ئەوەی پیاوی پیری کەنەفتە، هێزی مێخوازی کەمترە لە گەنجێكو ڕەنگە ئارەزووی نێرخوازی کچە بە تەواوی دانەمرکێنێ. ئەگەر لەبەر ئەمە نییە ئەدی لەبەرچییە؟

دیارە مەسەلەکە لە بنەڕەتداو سەرەتاوە هەموو هەر بە نێرومێخوازییەوە گرێدراوەو هیچی ترو ئەوەی دی کە دەگوترێت هەر بۆ قسەیەو ڕازاندنەوەی مەسەلەیە دەنا پیاوی پیرو هەژارو داراو نەدارو ئاغاش هەر مرۆڤن.

ئەگەر مێو نێر وەك یەکن لەبەرچاوی ئەوانەو لەیەك تای تەرازووی بۆچی شاعیرەکانو چیرۆکنووسەکان بە بەژنو بالاو خەتو خاڵو چاو برۆو مەمکی ژندا هەڵدەڵێن بە ئەندازەیەك تۆزی ژێر سوڵی ژن بە چاوو برژانگ بسرێو پاکی بکاتەوە، بۆچی کاکە شاعیر حەجمانی نامێنێ وەك پەپولەی شەوچرا خۆی دەسووتێنێ؟ بۆچی دروستە بۆ پیاو ئاوا بە ژنێکی جواندا هەڵبڵێو بۆ ژن دروست نییەو ئەگەر ژنێك وەك پیاو ئەو ڕەفتارەی کرد لێی لە هەڵلا دەدرێو وەك ژنێکی سوك تەماشا دەکرێ، خۆ ئەگەر مێرددار بێ ئەوە مێردەکەی هەرچەندە لە مافخوازانی ژنیش بێ ئەم ڕەفتارەی ژنەی پێ قبوڵ ناکرێو دەسەڵاتی مێرد بە پێی "دەستووری کۆنەپەرستی" بەلای مافخورانی ژن- بەکاردێنێو ژنە تەڵاق دەداو ئەگەر نەیکوژێ.

زۆر لە چیرۆکنووسەکانی کە بە ناوو زار لایەنی ژن دەگرن، زۆر باسی بە شوودانی کچ بە زۆرو مارەبڕینی لەسەر لانکەو درانی بە پیاوی کەنەفتەو نەدرانی بە دڵخوازی خۆیو خراپەی ژن بە ژن دەکەن، ئەگەر کەمێك لێی وردبینەوە دەبینین نە تەنها کچ یان ژن ئەو ڕەفتارانەی دەگەڵدا کراوەو دەکرێت بەڵکو کوڕو پیاویش هەمان ڕەفتاری لەگەڵدا کراوەو بە زۆر کچیان لێ مارە کردووەو دڵخوازی خۆشی نەبووە، بگرە چەند ساڵ بەر لە ئێستا هەر باوك داخوازی کچی دەکرد بۆ کوڕی نە کوڕە کچەی دیبوو نە کچەکە کوڕەی دیتبوو، تەنها شەوی گواستنەوەو بوكو زاوایەتی یەکتریان دەدیتو تازەش کار لە کار ترازابوو و هیچ یەکێکیان نەیدەتوانی پەشیمان بێت ژن بە ژنەکەش وەك کوڕ بە کوڕەو هەر چوارلا بێدەسەڵاتن و مارەبڕینی سەرلانکەش بۆ کوڕو کچ هەر وەك یەکن، کەوابوو ئەم حاڵەتانەی باسکران کوڕو کچو ژنو پیاو تێیدا یەکسانن و هەموو لایەك ستەم دیدەی کۆمەڵەو یەکسانن لەو چەوساندنەوەو بێ ئارەزوو کردنە، ئیدی ئەم هەموو کڕوزانەوە بۆ کچو ژن لە پای چی؟.. نازانم کە کوڕیش لەو کۆمەڵەدا هەمان ڕەفتاری کچی لەگەڵدا کراوە بۆ باسی مافی ئەو ناکەن؟.. یان ڕەنگ لایان وابێ ئەو کەسەی داوای مافی ئافرەت بکا پێشکەوتوو و خوێندەوارە!. یا "لغرض في نفس یعقوب"ە. لەم کۆمەڵەی کوردەوارییەدا زۆرجار کچی لە خۆگەڕاوە مارەی لە کوڕێکی منداڵ بڕاوە، واتە وەك ئەوەی کە کچێکی منداڵ مارە بڕی لە پیاوێکی لەخۆگەڕاوە، دەی بۆ باسی ئەم حاڵەتە ناکەنو داوای مافی ئەو کوڕە منداڵە ناکەن؟ ئەوجار کابرایەك لە جیاتی خوێنی خزمێکی کوژراوی- بەهەر ڕووداوێك بێ- ژنی وەرگرتبێ، خۆ کابرایەك لە جیاتی خوێنی خزمێکی کوژراوی- بەهەر ڕووداوێك بێ- ژنی وەرگرتبێ، خۆ کابراش نە ژنەی دیوەو نە حەزی لێکردوەو نە دڵخوازی خۆیشی بووە ئەو ژنەی دەدرێتێو لێی مارە بکرێو لە پاشدانیش ناتوانێ تەڵاقی بدا، ژنی خوێن دراویش هەمان چارەنووسی هەیە.

ژن بە ژن، یان بڵێم پیاو بە پیاو. ئەگەر کوڕی خوشکدار یا پیاوی کچدار، ژن بە ژن نەکەن، لەناو ئەو کۆمەڵگایە چۆن ژنیان وەگیر دەکەوێ بە


- بۆچی دروستە بۆ پیاو ئاوا بە ژنێکی جواندا هەڵبڵێو بۆ ژن دروست نییەو ئەگەر ژنێك وەك پیاو ئەو ڕەفتارەی کرد لێی لە هەڵلا دەدرێو وەك ژنێکی سوك تەماشا دەکرێ؟
- ئەم حاڵەتانەی باسکران کوڕو کچو ژنو پیاو تێیدا یەکسانن و هەموو لایەك ستەم دیدەی کۆمەڵەو یەکسانن لەو چەوساندنەوەو بێ ئارەزوو کردنە






چ جۆرێك و شێوەیەك خێزان دامەزرێنن؟ ئایا ئەو ژنانەی ئاوا پیاوە مافخوازانی ژن بونەتە قەڵغانیان بۆ دابین کردنی مافیان هیچیان بێزیان دێ یا بە خەیاڵیاندا دێ مێرد بە كوڕێكی نەخوێندەواری لادێ بكەن؟ هەرچەند كوڕەش ڕێك و پێك و لەبارو قۆزبێ.

ڕەنگە لایەنگرانی مافی ژن بڵێن "ئاخر حەزی لێناكا چۆن شووی پێ بكا، دەنا ئەگەر خواست و ئارەزووی دڵەو هیچ مەسەلەیێكی تر لە كایەدا نییە؟ بەڵام كچە خوێندەواری شارستانی قەت و هەرگیز خەیاڵ و دڵی بەلای شوان و گاوان و جوتیارێك بگرە بەلای كرێكارێكی شاریشدا ناچێ. ئەگەر لێم توورە نەبن دەڵێم كچە لادێش ئەگەر خوێندنی سەرەتایی تەواو كردبێ دڵ و خەیاڵی بەلای كوڕێكی شارستنیدا دەڕوا؟ چونكو كچە دەیەوێ شوو بە یەكێ بكا كە دواڕۆژی بۆ دابین بكاو خاوەن كۆشك و تەلارو ئۆتۆمبیلی باش و دەزگای جۆراوجۆری ناوماڵ بێ و هەبووە بێ، كەوایە چۆن خەیاڵی حەزی بەلای كوڕە لادێیی و گوند دەچێ؟! كەچی كوڕی خوێندەواری گوندی یا كوڕی شار گەلێ زۆرن لەوانە كە خوێندنی باڵاشیان تەواوكردوە كچی نەخوێندەواری لادێیان هێناوەو لە گەڵیشی گونجاون و بە دەگمەن بیستراوە یا ڕوویداوە، كە ژنی خوێندەوارو پارەدار شووی كردووە بە كوڕێكی هەژاری نیمچە خوێندەوار ئەگەر هۆیەكی تر نەبێ، جا با بپرسین ئایا هیچ یەك لەوانەی مافخوازی ژن و دژ بە ژن بە ژنن ئامادەن خوشكی یا كچی دەرچووی دانیشگاو زانكۆ بدەن بە كوڕێكی نەخوێندەواری كرێكار یان نیمچە خوێندەوار با كچەش حەزی لێبكا؟ من وا تێدەگەم كە نایدەن و هەزارو یەك بەڵگەو بەهانە بۆ كچە پەیدا دەكەن و كە هێشتا منداڵەو بەرژەوەندی خۆی نازانێ، دەنا ئەم لە كوێ و ئەو هەتیوە بەرەڵڵایە لە كوێ؟

دەیسا مامۆستاكان چار چییە؟ كوڕی لادێییەكان و نەخوێندەوارەكان ژنیان چۆن دەستكەوێ؟ یان ئەوانیش خۆ تەرخان بكەن بۆ ڕۆژی دوایی و بەهەشت و حۆرییەكان و ببنە ڕەبەنی دێرێ؟

لە كاتێكدا خراپی ژن بە ژن باس دەكەن، پێویستە چارەیەكیش بۆ ئەوانە بدۆزنەوە كە لەم ڕێگایەوە نەبێ ژنیان دەستناكەوێ.

دیسان ئەگەر ژن دەبێ وەك پیاو ڕەفتاری دەگەڵدا بكرێ و هەمان مافی هەبێ كە بۆ پیاو هەیە، بۆچی كە ژن شوودەكا دەبێ مێرد ئەركی هەموو ماڵ دانان و دامەزراندنی لە سەرشان بێ و سەرباریش پارەو دراوێكی زۆریش بدا بۆ جلوبەرگ و زێڕو پشتێنەو خەناوكەو ملوانكەو لاسەرەو گوارەو خشڵی تر، بن باریش چەند سەد مستقاڵ زێڕیش مارەیی پاشەكی بێ، كە زاوا هەرچی دارایی هەیە هەمووی لە ڕێگای ژن هێنانێك دادەنێ و دەستەوئەژنۆ دادەنیشێ و تا لێوانیش بە ژێر قەرزدا دەكەوێ، ئایا چیرۆكنووس و نووسەرە مافخوازەكانی ژن بۆ خۆیان بیریان لەمە كردووەتەوە؟ كە لە لایەك ئازادی و ماف بۆ ژنان دەخوازن، ژنانیش تا نرخیان پترو گرانتر بێ خۆیانیان پێ هەڵدەكێشن و لافی پێ لێدەدەن، جا كچە خوێندەوارەكان و زانكۆییەكان پتر لە كچە نەخوێندەوارەكان بەمەوە نووساوون كە نرخیان لە پێشەكی و پاشەكی پتر بێ و زۆریش هەیە كچە نەخوێندەوارەكە بیری بۆ ناچێ و نایزانێ بەڵام خوێندەوارەكە دەیزانێ و داواشی دەكا و هەرچی مۆدی وڵاتە ڕۆژئاواییەكانی سەرمایەدار هەیە دەیەوێ لە كۆمەڵگای كوردیدا جێبەجێ بكا. بەم چەند شیرینەو چەند خۆش و جوانەو چەند مرۆڤایەتییە كە هەردوولا كچ و كوڕ- یا بڵێین دەزگیران یا ژن و مێرد پێكەوە بە دەستەوایی ماڵێك كە لە توانای هەردووكیاندایە پێكەوە بنێن و هیچیان داوای مارەیی لەوی دی نەكا، نە پێشەكی و نە پاشەكی. بە تایبەت خوێندەوارەكان و فەرمانبەرو مووچەخۆرەكان لە كوڕو كچ، كە وەك برادەران داخوازییانە خۆ ئەوان بە دڵی خۆیان و بەبێ هیچ زۆرێك یەكدی دەخوازن با ئەوان وا بكەن و بەهانە بە یەكتری نەگرن و ئەو بارە قورسە نەخەنە سەرشانی زاواو باوكی دوواڕۆژ.

بەڵام مافخوازانی ژن دەیانەوێ لە هەموو لایەكەوە ژن مافی هەبێ وەك پیاو، واتا هاوتای پیاوبێ لە بارداو سەرباریش مافی ژنی ڕۆژانی زوویشی هەبێ، لە خشڵ و مارەیی و بەرگ و ماڵ دانان و ناندان. بە قسەی ژن مافخوراوو بەشخوراوەو پەككەوتوو و دەست و پا بەندە، بەڵام لە ڕاستیداو لە كۆمەڵگای ئێمەی كوردەواریدا ژن پاش مێردكردنی سەردارو بەندكاری پیاوەو لە ماڵدا

ئەگەر ژن دەبێ وەك پیاو ڕەفتاری دەگەڵدا بكرێ و هەمان مافی هەبێ كە بۆ پیاو هەیە، بۆچی كە ژن شوودەكا دەبێ مێرد ئەركی هەموو ماڵ دانان و دامەزراندنی لە سەرشان بێ و سەرباریش پارەو دراوێكی زۆریش بدا بۆ جلوبەرگ و زێڕو پشتێنەو خەناوكەو ملوانكەو لاسەرەو گوارەو خشڵی تر، بن باریش چەند سەد مستقاڵ زێڕیش مارەیی پاشەكی بێ؟

سەرکارو کاربەدەستە. با کەمێك لێی وردبینەوە بزانین لە کاروباری ماڵو منداڵو تا چوونەدەرو سەرلێدانو بانگهێشتنو ئەم جۆرە شتانە لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی، کێ بڕیاری لەسەر دەدا مێرد یان ژن؟ دیارە ژن سەرپشکی هەیە لە هەموو ئەوکارانە، بگرە تا کڕینو فرۆشتنی خانوو و ئۆتۆمبیلو شتی تری ناوماڵ، بەڵکو پیاو هەروەکو کرێکارێکەو دەبێ فەرمانی ماڵەوە جێبەجێ بکات. چونکە ئەگەر وا نەکا ماڵوێران دەبێ ژنە لێی زیز دەبێو ڕەنگە وایلێبێ کار بگاتە تەڵاقدان، ئەمەش دیسان ماڵوێرانیەکی ترە لە ڕووی تێکچوونی ماڵو خێزانو خەرجی ئەو هەموو مارەیی پاشەکییە.

ئەوجار هەندێ ژن کە بە کچێنی هەر ڕەوشتو ڕەفتارێکی تایبەتی خۆی هەبووبێو کردبێتی لە خۆتاسو لوسدانو ئارایشت کردنو خۆ ڕازاندنەوەو جلی جوان لەبەرکردنو هاتوچۆکردندا دەستە خوشکانیو دۆستانی، قبوڵو شتی تر، کە مێردیشی کرد ئەوانە بە پترەوە هەمووی دەکاو بەبێ لێکدانەوەی باری ژیانی مێردیو دەرامەتیو پێداویستی تر، ژنە ئەوەی دەیەوێ دەیکا، چونکە ژنی فیسارە کەس هەیەتیو وا دەکا، یا هەروا حەزی لێیەتی، مێردیش دەبێ دەست لەسەر سنگو ملکەچ بوەستێو بڵێ بەسەرسەر، بەڵام کوڕ ئەگەر هەندێ ڕەفتاری تایبەتی خۆی هەبووبێ وەك دانیشتن لەگەڵ هەندێ دۆستو برادەری خۆی یا چوونە یانەیەك، ئەوا پاش ژن هێنان دەبێ لە کاتی دیاریکراودا بگەڕێتەوە ماڵو نابێ دەستووری ژن هیچ کارێك لەوانە بکا.

تا ئێرە درێژدادڕی بوو وەك هەندێ وەرزێر لە گوندان کە وتووێژیان دەکرد لە باسەکەیان دەردەچوون، یەکێك لەوان دەیگوت کاکە ئێمە باسی چ دەکەینو تۆش دەڵێی چ، لە وەڵامدا کە دەیزانی قسەکانی لە جێی خۆی نەبوو دەیگوت "خزمە مەبەستم لە قسەیە قسە) لێرەدا منیش مەبەستم لە قسەیەو تکای لێبوردن دەکەمو قسەکەش ئەمەیە کە هەندێ نووسەرو چیرۆکنووس دەیانەوێ مافی ژن وەك نەوعی ئینسانێ تەماشا بکرێو ئەم "ڕا" یە "نەوعی"یە بە مل ئاینی ئیسلامدا دابڕن، بە گوتەی ئەوان ئاینی ئیسلام چاکتر لە هەموو یاساو قانونێکی شارستانی ئەم جیهانە، ئەو هەموو مافە یەکسانییەی نێرو مێی دابینکردووەو ڕوونو ئاشکرای کردووەتەوە، بەڵام کۆلکە مەلاکانی کوردستان بە ئارەزوو و دڵخوازی خۆیانو بۆ پارەو پولو مافی دونیای دوون مافیان لە ژن ئەستاندۆتەوەو مارەو تەڵاقیان لەبەردەست دەرهێناونو بە زۆرەملێ داویانە بە پیاوو بەناوی دینی ئیسلام.

نازانم هەندێ کەس کە خوێندنی باڵا تەواو دەکەن یا هەندێ لەوانەی قۆناغی دووەمی قوتابخانە دەبڕنو کەمێك هاتوچۆی مزگەوت دەکات بۆ وازوو بە پەلە پەلیان لەبەرخۆ دەچێو وا تێدەگەن کە ئاینیش چاکتر لە مەلا تێدەگەنو هەرچی بە زمانی عەرەبی نووسرابێ لایان وابێ ڕوونو ئاشکرایە؟ بە تایبەت ئەگەر دوو ڕەکات نوێژ بکەن، یا چەند ڕۆژێك زکی خۆیان لە مانگی ڕەمەزاندا برسیو تینوو بکەن کە بە ناو بە ڕۆژوون، ئەوانە وەها لە خۆ دەگەن کە جێگری پێغەمبەرن (د.خ) وەك مەلا موجتەهیدەکانی پێشوو بەگژ مەلادا دەچن، ئەو مەلا بەدبەختەی کە ساڵەکانی ژیانی خۆی لە خوێندنو لێکدانەوەی ئاینی بەسەر بردووە، بە کەساسیو گەڕانی شارەو شارو دێبەدێ تا توانیویە پەی بەم شەریعەتی ئیسلام بەرێ، کەچی ئەوانە لێی دەبنە پێغەمبەری زەمانەو پێیان دەڵێن "کۆلکە مەلاو دژ بە ئاینو شەریعەتو نەفامو نەخوێندەوار". چونکە ئەو تازە خوێندەوارانە دەیانەوێ ئایین لەگەڵ هۆشو ئەو زانستانە بگونجێنن کە هەندێکیان لێ هەڵکڕاندووە بە بێ ئەوەی هیچ شارەزاییەکی قوڵیان لە ئایین هەبێو بە پێی هەوەسو ئارەزووی خۆیان چۆنیان دەوێ بۆی دادەدڕن، و بە پێی دڵخوازی خۆیان ئایین ڕێکدەخەن جۆری دەکەن لەگەڵ ڕژێمەکانی پاش ئیسلام کە بە "پێشکەوتوو" ناسراوون، جا سەرمایەداری بێ یا سۆشیالیستی یا ناسیونالی بێ، بە پێی ویستو کاتو چەرخ لە کاتێکدا ئایینی ئیسلام کە هاتووەو پەیدابووە ئەم زاراوانەو موستەلەحاتانەی ئەمڕۆ هەن نەبوون.

خۆی ئاینی ئیسلام وەك یاساو دەستوورێکی سەربەخۆیەو جیاوازی زۆرە لەگەڵ ڕژێمەکانی ئەمڕۆدا، بیروبڕوایەکی ڕەوشتو ئەخلاقییە پتر لە هەر شتێکی تر یاساێکی کۆمەڵایەتییەو

ئەو تازە خوێندەوارانە دەیانەوێ ئایین لەگەڵ هۆشو ئەو زانستانە بگونجێنن کە هەندێکیان لێ هەڵکڕاندووە بە بێ ئەوەی هیچ شارەزاییەکی قوڵیان لە ئایین هەبێو بە پێی هەوەسو ئارەزووی خۆیان چۆنیان دەوێ بۆی دادەدڕن و بە پێی دڵخوازی خۆیان ئایین ڕێکدەخەن و جۆری دەکەن لەگەڵ ڕژێمەکانی پاش ئیسلام کە بە "پێشکەوتوو" ناسراوون.





چونکە تەفسیراتی قورئان بەر تیشکی هەندێ زەواهیری تەبیعی دەگۆڕێ، ئەو گۆڕانەش دەبێتە هۆی وێك نەکەوتنی تەفسیراتی قورئان و تەفسیراتی زانستی، بۆیە دەبێتە هۆی هەڵگەڕانەوەی نیمچە خوێندەوار

پەیوەندی نێوان خەڵك و خودایە پتر لە هەر مەوزوعێکی دیکە، ئەوجا ئەگەر مەوزوعێکی تری گێڕابێتەوە وەك باسکردنی ڕووداوێك و پێیەوە بنووسێنن و تەفسیرات و تەئویلاتی بۆ بکەن بە دڵ و ئارەزوی خۆیان، ئەوە دوورە لە ئیسلام و لە ئەنجامدا ئەو جۆرە تەفسیرات و تەئویلاتانە وا لە خەڵکی موسڵمان دەکەن کە هەڵبگەڕێنەوە لە ئیسلام، چونکە تەفسیراتی قورئان بەر تیشکی هەندێ زەواهیری تەبیعی دەگۆڕێ، ئەو گۆڕانەش دەبێتە هۆی وێك نەکەوتنی تەفسیراتی قورئان و تەفسیراتی زانستی، بۆیە دەبێتە هۆی هەڵگەڕانەوەی نیمچە خوێندەوار. وەك لەمەوبەر هەندێ لە مەلا میسرییەکانی خۆ بە عەسری زان ئایەتی "و بنینا فوقکم سبعا طباقا" یان لێکدابووەوە بە کۆمەڵەی ڕۆژ کە ئەوکاتە زاناکان تا حەوت کۆمەڵەیان لێ وەدیار کەوتبوو، بەڵام لە پاشدا کۆمەڵەی ڕۆژ لە حەوت تێپەڕی بۆیەیە ناچاری گوتیان نەخێر مەبەست لەم "سبعا طباقا"ە حەوت "گازە" کە لە ئاسماندا هەیە، ئەمەش سەرینەگرت، جا لێرەدا خەڵك دەبێ چ بڵێ ئایا قورئان لەگەڵ زانست ناجۆرە؟ یان تەفسیراتی خەڵکەکە هەڵەیە، دیارە تەفسیراتەکان ڕاست نین و هەقە لەم مەوزوعانە مەلاکان و زانا ئاینییەکان خۆیان لێ لادەن و هەوڵی ئەوە نەدەن هەرچی زانست دایدەنێ بڵێین لە قورئاندا هەیە و پاش ڕوونبوونەوەو داهێنانی ئایەتی قورئانی لەسەر جێبەجێ بکەن، وە دەڵێن قورئان باسی کارەبا دەکا لە ئایەتی (25) لە سورەتی ئەلنوور "الله نور السموات و الارض مثل نوره کمشکات فيها مصباح المصباح في زجاجة الزجاجة كأنها كوكب درّي يوقد من شجرة زيتونة لا شرقية و لا غربية يكاد زيتها يضيء" لە کاتێکدا ئەم قورئانە سەدان ساڵ پیش ئەدیسۆن هاتووەتە خوار، ئەوە بوو تا ئەدیسۆن کارەبای نەدۆزیەوە کەسێك لەم هەموو مەلاو شارەزا ئاینیانە ئەم کارەبایان لەم ئایەتە وەرنەگرت؟ و ە ئەدیسۆن دۆزیەوە دەڵێن لە قورئاندا هەیە.

یان پاش دۆزینەوەی ئەتۆم و دروستکردنی دیسان هەندێ نەخوێندەوار گوتیان قورئان باسی ئەتۆم دەکات کە لە سورەتی زیلزالدا دەڵێ "و من يعمل مثقالة ذرة خيرا يره و من يعمل مثقالة ذرة شرا يره" لە کاتێکدا مەبەستی ئایەت شتێکی ترەو هەندەی ئاسمان و ڕیسمان لەم مەعناو تەفسیرە دوورە، چونکە ئەگەر وەك ئەو نیمچە موسوڵمانانە کە بڕوایان کزەو بۆ پتەوکردنی بڕوای خۆیان دەیانەوێ ئاوا تەفسیر بکەن، ئەوها بوایە قورئان باسی پیشەسازی بکردایە دەبوو پێغەمبەر (د.خ) چاکتر لە هەموو کەس و پێش هەموو کەس لەو مەبەستانە بگەشتایە بیزانیایەو چەکی قورسی دروستبکردایە بۆ لەناوبردنی دوژمنانی ئیسلام، وەك خودا لە قورئاندا فەرمان بە پێغەمبەر (د.خ) و موسوڵمانان دەدا، کە هەچی لە دەستیان دێ لە هێزو توانا دروستی بکەن بۆ چاوترساندن و تۆقاندنی دوژمنانی خواو موسوڵمانان کە ئایەتی (61) لە سورەتی ئەنفالدا دەڵێ "و اعدوا لهم ما استطعتم من قوة و من رباط الخيل ترهبون به عدوّالله و عدوكم و آخرين من دونهم لا تعلمونهم الله يعلم.. الخ" دیارە موسوڵمانان لە سەرەتای ئیسلامەتی تا ئێستاش نەیانتوانیوە چەکێك دروست بکەن وەك چەکی دوژمنانی ئیسلام، ئەگەر هیچ کورتە باسێك و نیشانەیەك بۆ ئەم چەکانەو پیشەسازییانە لە قورئاندا هەبوایە دەبوو خەڵکی جیهان لە عەرەب و ئیسلام فێری دروستکردنیان بووبان لە کاتێکدا موسوڵمانەکان پاش مەشق پێکردنیشیان ئینجا ناتوانن دروستکراوی ناموسڵمانەکان بەکاربەرن. ئیدی ئەم بانگەوازە بێ جێیە کە هەر وشەیەك لە قورئاندا هاتبێ بیگێڕنەوە بۆ ئەو دەزگا تازە دەرچووە، ڕاست نییەو دوورە لە ئیسلام، ئیسلامیەت فەلسەفەیەکەو دوورە لە پیشەسازی وەك هەموو فەلسەفەکانی تری جیهان. مەبەست لە ئیسلام و هاتنی پیغەمبەر (د.خ) ڕەوشتی چاکەیە وەك پێغەمبەر (د.خ) دەڵێ "انما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق" واتە من ناردراوم بۆ ئەوەی ڕەوشتە چاکەکان تەواو بکەم بیان چەسپێنم و جێگیریان بکەم لەناو کۆمەڵدا.

دیسان لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە کە کاتی خۆی عەرەبەکان دارخورمایان تەلقیح دەکرد پێغەمبەر (د.خ) بەلایاندا تێپەڕی لێی پرسین ئەمە چییە؟ پێیان گوت ئەمە دەبێ وا بکرێ فە رمووی وازی لێبهێنن ئەوەی خواکردبێ بێ ئەمەش دەبێ و وازیان هێنا ساڵی داهاتوو بەرەکەی نەگرت و چوونەی لای پێغەمبەر (د.خ) و ڕایانگەیاند کە دارخورماکان بێ تەلقیح کردن بەریان نەگرتن

پێغەمبەر (د.خ) لە وەڵامدا گوتی "خۆتان کاروباری دونیاتان باشتر دەزانن".

جا ئەگەر موسوڵمانی ئەوکاتی وەك ئەو موسوڵمانە بڕوا کزانەی ئەمڕۆی خۆمان بان، دەبوو لە پێغەمبەر (د.خ) هەڵگەڕێنەوە چونکە پێغەمبەرێك نەزانێ دارخورما بێ تەلقیح بەر ناگرێ ئەمە چۆن پێغەمبەرێکە، بەڵام موسڵمانانی ئەوکات لە قورئان دەگەیشتن، کە پێغەمبەر (د.خ) ڕێبەری فکریو ئاینییەو پێغەمبەری کشتوکاڵو پیشەسازی نییەو ئەوانە پەیوەندیان بە کۆمەڵەو کۆمەڵ بۆ خۆی هەوڵی پێشکەوتنی دەدا. مەبەست لە ئیسلام پەیوەندی نێوان خەڵك لە لایەك لە لایەکی تر پەیوەندی نێوان خوداو کۆمەڵی ئینسانە کە ڕێك بخرێو چاك بکرێ.

با بێمەوە سەر باسی خۆمان، بۆ ئەوەی لە هەموو کوردێك ڕوونو ئاشکرابێت کە ئیسلام لە بارەی ژنو پیاو چی گوتووەو حوکمی چییەو چۆن دەڕوانێتە پلەو مافی ژنو پیاوو پەیوەندی خێزان لەسەر چ بناغەیەك دامەزراوە، من لەمەودوا باسی دەکەمو سەرچاوەی بنەڕەتیشم بۆ ئەم مەبەستە قورئانی پیرۆزو گوتەو کردارو ڕەفتارەکانی پێغەمبەرە (د.خ) کە لە کتێبەکانی حەدیسی (موسلیمو بوخاری)م وەرگرتووەو ڕای ئیمامی شافیعی (خ.ل) بە ئیجماعو قیاسیشەوە.

دیارە ئەوەی قورئان باسی کردبێو حوکمی لەسەر دابێ نە بە حەدیسو نە بە ئیجماع و نە بە قیاس هەڵناوەشێ، واتە دەق "نص"ی قورئان هەموو قسەیەكو حوکمێك بەتاڵ دەکاتەوە ئەگەر درابێ دەبی ڕەفتار بە فەرمانی قورئان بکرێو نابێ دەستکاری حوکمەکانی قورئان بکرێ لەو ڕۆژەوە هاتووە تا دونیا دەبڕێتەوەو هەتاهەتایە وەك خۆی دەمێنێو ئەسبابی موجیبەیشی کە کاتی خۆی لەبەر چی هاتووە، لەبەر هەمان هۆ دەمێنێو ناگۆڕێو بۆ هاتنی ئەو حوکمە چ مەبەستێك لەبەرچاو گیراوە هەمان مەبەست هەر دەمێنێو هەرکەس بیەوێ بیگۆڕێ یا دەستکاری بکا بە پێی حوکمی قورئان بە کافرو دژ بە ئیسلام دەژمێردرێو بە موسوڵمان ناناسرێ، وەك قورئان لە سورەتی ئەلمائیدە ئایەتی (44)دا دەڵێ "و من لم یحکم بما انزل الله فأولئك هم الفاسقون" ئایەتی (45)و لە ئایەتی (48،49،50،51) لە هەمان سورەتدا فەرمان بە پێغەمبەرو موسوڵمانان دەدا کە بە پێی قورئان ڕەفتار بکەنو حوکم بکەن وەك دەڵێ "و انزلنا الیك الکتاب بالحق مصدقا لما بین یدیه من الکتاب ومهیمنا علیه فاحکم بینهم بما انزل الله و لا تتبع اهوائهم عما جاءك من الحق.. الخ" جا کەسێك بڕوای بە خواو ئیسلام هەبێ دەبێ لە قورئان دەرنەچێ، ئەگەر دەرچوو ئەوا بە موسوڵمان ناژمێردرێو دژ بە ئیسلام دەنووسرێ مافی ئەوەی نییە بەناوی ئایین قسە بکا.

ئەگەر قورئانو قسەی پێغمبەر(د.خ) واتە (حەدیس) کەوتنە بەرامبەریەك، واتە وێك نەکەوتنو هەریەکە حوکمێکی دابوو بە پێچەوانەی یەکتری، ئەوە حوکمی قورئان سەرپشکەو هەموو حوکمێك بەرامبەر قورئان بەتاڵە، جا با ئەو حوکمانە بە حەدیس یا ئیجماع یا بە قیاسو ئیجتیهاد دران.

لەم لێکۆڵینەوەمدا یەکەم قورئانم کردووە بە بەڵگەو دیکۆمینتو گەڕاوەمەتەوە سەر تەفسیری (بەیزاوی)، دووەم قسەو ڕەفتارەکانی پێغەمبەر (د.خ) کە لە ڕێگەی موسلیمو بوخاری) پێمان گەیشتووەو سێهەم فیقهی ئیمامی شافیعی (خ.ل) کە زۆربەی نەتەوەی کورد لەسەر ڕێڕەوی ئەوون، واتە شافیعی مەزهەبنو هیچ قسەیەك لە خۆمەوە دەربارەی ژنو پیاوم نەگوتووەو نەنووسیوەتەوە بەناوی ئاینو هەموویم لەم سێ سەرچاوە هەڵێنجاوەو ئەوەی مەبەستی ئەوەی هەبێ پتر لە ئایین بگا لە هەموو ڕوویێکەوە، نە تەنها دەربارەی ژنو پیاو با بگەڕێتەوە سەر حەدیسەکانی موسلیمو بوخاریو قورئانو کتێبە فیقهییەکانی مەزهەبی ئیمامی شافیعی خۆی، وەك کتێبی (ئەلئوم) یا کتێبەکانی تری ئەو مەزهەبە وەك (شەرحە مینهاج) و (ئیعانە).

جا یەکێك لە نووسەرەکان دەڵێ (چیرۆکنووس کە تاوانکاری تێنەگەیشتنی مەلای گوندەکە باسدەکا، بەوەی ئەو منداڵە ساوایانە لە لانکەدا مارە دەکا تەنها وەك شتێکی تاکیو هەڵوێستی مەلاکە بۆی ناچێ، بەڵکو کرداری ناپاکی ئەو مەلایە تەعمیم دەکاو دەیخاتە ئەستۆی شەریعەت، ئێمە پێمان وایە لەوەدا پەلەی کردوە یا مەبەستی بووە مەسەلەکە بکاتە دەستکەلا بۆ لێدانی شەریعەت، لە کاتێکدا پێش ئەوەی چیرۆکنووس دەنگی ناڕەزایی بەرزبکاتەوەو داوای سەربەستی خێزان دروستکردن بکا، شەریعەت خۆی وەك ڕێگایەکی

ئەگەر قورئانو قسەی پێغمبەر(د.خ) واتە (حەدیس) کەوتنە بەرامبەریەك، واتە وێك نەکەوتنو هەریەکە حوکمێکی دابوو بە پێچەوانەی یەکتری ئەوە حوکمی قورئان سەرپشکەو هەموو حوکمێك بەرامبەر قورئان بەتاڵە





نازانم ئەم جۆرە نووسەرانە ئەو شەریعەتەی باسی لێوە دەکەن دەبێ کام شەریعەت بێ؟! مەگەر شەریعەتێکی خەیاڵی خۆیان بێ کە هێشتا خەڵك پێی نەزانیبێ، دەنا نەدەبوو ئەم جۆرە کەسانە ئاوا بە ئارەزوو و دڵخوازی خۆیان بە ناوی ئایین و شەریعەت ئەو یاساو ڕەفتارانە لە قەڵەم بدەن

ڕاستەقینەی ژیان و وەك تەواوترین ڕێبازو کامڵترین یاسا بانگی بەتاڵکردنەوەی مارەبڕین و تەڵاق و نکاحی بێپرس و دووژن هێنان و هەرچی پەیوەندی لە دوورەوە یا لە نزیکەوە بە چەوساندنەوەی ئینسانەوە هەیە پوچەڵ دەکاتەوە هەر ئەمیش بە جوانترین شێوە دەیەوی بەرگری لە ژیانی بە خۆشی پێکەوە ژیانی مرۆڤایەتی بکا، جا ئەگەر لە هەر شوێن و کاتێکدا بە هۆی هەندێ کۆلکە مەلاو دوژمنی شەریعەتەوە کاری وا کرابێ پێچەوانەی خزمەتی ئینسانیەت بێ، ئەوا لای هەموو خاوەن ویژدانێك ئاشکرایە کە تەنها ئەو کەسانە تاوانبار دەکرێن و بەر لەعنەتی ڕۆژگار دەکەوون، نەك ڕێبازو فەلسەفە)..

ئەمە قسەی نووسەرە لێرەدا بڵێم نووسەر هەر فری بەسەر زانینی ئایینەوە نییەو ئاگای لە هیچ نییەو نە قورئانی خوێندووەتەوەو نە تێگەیشتووە، ئەگەر خوێندبێتیەوە، نە ئاگای لە ڕەفتارو کرداری پێغەمبەر (د.خ) هەیەو نە لە بیروڕای موجتەهیدەکانی مەزهەبی ئاگادارە، بە تایبەتی مەزهەبی شافیعی کە مەزهەبی زۆربەی کوردانە. نووسەر لای وایە بە ڕەوانی لە شەریعەتی ئیسلامی کردووە، بەڵام نازانێ ئەوەی ئەو بە کۆلکە مەلای دادەنێ و دژ بە ئایین تاوانبارو بێویژدانی دەژمێرێ ئیمامی شافیعی (خ.ل) دەگرێتەوە.

با یەکە یەکە قسەکانی نووسەر بەراورد بکەین لەگەڵ ئایین و ڕەفتاری پێغەمبەر (د.خ) لە هیچ کاتێکدا لە چوار تا دوانزە ژنی کەمتر نەبووە سەرەڕای ئەو ژنانەی، گورجی و کەنیزەکی هەبووە، ئەوجار موسوڵمانانی تریش تا چوار ژن پێکەوە بە پێی دەقی ئایەتی قورئان ڕێدراوە هەر پیاوێك دەتوانێ هەرچەند دڵی بخوازێ ژن بێنێ بە مەرجێك لە چوار پتر کۆنەکاتەوە لە یەك کاتدا، وەك ئەمڕۆ چوار ژن بێنێ و چەند ڕۆژێکی تر یا هەر بۆ ڕۆژی دوایی هەر چواریان تەڵاق بداو چواری تر بهێنێ، یان لەو چوارانە یەك دوانێك تەلاق بداو یەك دوانی تر بێنێتە جێگایان و بەم جۆرە، لە پاشا بە درێژی باسی دەکەین، ئیدی ئەم قسەیە لە کوێ دەمێنێ کە دەڵێ (ئایین دوو ژن هێنان پوچەل دەکاتەوە) قسەکانی نووسەر بە تەواوەتی پێچەوانەی ئایەتی قورئان و حەدیسە ڕاستەکانی پێغەمبەرو ڕەفتارو کردارەکانیەتی، نازانم ئەم جۆرە نووسەرانە ئەو شەریعەتەی باسی لێوە دەکەن دەبێ کام شەریعەت بێ؟! مەگەر شەریعەتێکی خەیاڵی خۆیان بێ کە هێشتا خەڵك پێی نەزانیبێ، دەنا نەدەبوو ئەم جۆرە کەسانە ئاوا بە ئارەزوو و دڵخوازی خۆیان بە ناوی ئایین و شەریعەت ئەو یاساو ڕەفتارانە لە قەڵەم بدەن و نە ئەوانەش بێپەرواو بێباك هێرش ببەنە سەر مەلای چارە ڕەشی کوردەواری، کە هەموو ئازارو کوێرەوەری و بێنانی و تاڵ و سوێری چێشتووە تا ئەوەندە لە ئایین گەیشتوەو وەك هەیەو چۆنە ئاواشی لە خەڵك گەیاندوەو بۆی گێڕاونەتەوەو ڕەفتاری پێکردووەو کاروباری خەڵك و پەیوەندیان لەگەڵ یەکتری لەسەر بناغەی ئایین بێ چەندو چوون و بێ ئەملاو ئەولا جێبەجێیان کردووەو هەر مەلایەك گەڕابێتەوە سەر (قیل و قال) لەناو مەلایان و خەڵکیش بەدناو و دین سووك ژمێردراوە، بۆیە هەموو مەلاکانی موسوڵمان و زانا چۆن ئیمامە موجتەهیدەکان فەرموویانە جێبەجێیان کردووەو بە موو لێیان لانەداوە، ئەگەر ئەم مەلایانە نەبوونایە بێگومان ئێستا ئایینی ئیسلام لەناو کوردا وەك ئاردی ناو دڕك و بەردی بنگۆمی لێدەهات، مەگەر تەنها ناوی بمابایە، لە کاتێکدا لەبەر بوونی مەلا ئێستاش دین بە هەرمێینەو خەڵك پێوەی نووساون، بگرە هەیە سەروماڵ و منداڵی لە پێناویدا دادەنێ. کاکی نووسەریش هەروا بە سووك و ئاسانی لەقەبی کۆلکەمەلاو نەزانیان تەکریم دەکا، بەبێ ئەوەی خۆی بزانێ ئایین چییە؟ ئەوەندە نەبێ کە بە منداڵی لە دایك و باوکی گوێبیست بووبێ یا لە کۆمەڵی دەوروپشتی کە زۆربەشیان بڕوای پیرەژنانەو دوورن لە ئایین و ئەوەی لە قوتابخانەکانیش خوێندویانە ئەوە نییە پشتیان پێ ببەسرێ.

ئەوجار ئەو نووسەرو چیرۆکنووسانە کە بەردەبنە گیانی مەلاو هەزارو یەك ناوناتۆرەیان لێدەنێن پێیان دەڵێن کۆلکە مەلا، بە قسەی خۆیان لەبەر ئەوەیە کە لە ڕێگەی شەریعەت لایان داوە، باشە ئەگەر وایە دژ بە دین و مەلا نینن خۆ دەرچووی (حقوق)یش و (پارێزەر) ئەگەر لە ڕاستیدا هیچ نەزانێ و کۆلکە بێ، یان هەزار نارەوایی کردبێ بە ڕەواو توشی هەزار ئۆباڵیش بووبێ، بۆچی پێی نالێن "کۆلکە پارێزەر"؟!.

دیارە هەر لەبەرئەوەیە، ئەوەی خەریکی دین بووبێ لە لایەن ئەو کەسانە ناخۆشەویست بوون، هەر لەبەرئەوەی خەریکی دینن، چونکە وەك پێشتر باسمانکرد، ئەگەر مەلا لە کوردستاندا نەبووایە دەمێك بوو خوا موسوڵمانیەتی بۆ خۆی بردبووەوەو لە کولەکەی تەرپیشدا ناوی نەدەهات. ئەوەتا نووسەر بە مەلای شارەزاو زاناکانی ئایین دەڵێ کۆلکە مەلاو نەخوێندەوار. زۆری تریش هەن لەم بابەتە چی سووك و ناڕەوایە لە ملی مەلاکانی دەخەن. مەلاش هیچ تاوانێکی نییە تەنها جێبەجێکردنی فەرمایشتەکانی قورئان و پێغەمبەر (د.خ) و بیروڕای موجتەهیدەکان نەبێ، کە بۆ خەڵکیشیان ڕوونکردووەتەوە، جا سەرەڕای گوتنی کۆلکە مەلایی پێشیان دەڵێن بێویژدان و دژ بە ئایین و لە ئینسانیەت بێبەری!!

ئەمە لە بارەی مارەبڕینی کچی سەر لانکەو دوو ژن هێنان ئەوجار با بزانین نووسەر کە دەڵێ "هەر ئەمیش بە جوانترین شێوە دەیەوێ بەرگری لە ژیانی بە خۆشی پێکەوە ژیانی مرۆڤایەتی بکا، جا ئەگەر لە هەر شوێن و کاتێکدا بە هۆی هەندێ کۆلکە مەلاو دوژمنی شەریعەتەوە کاری وا کرابێ پێچەوانەی خزمەتی ئینسانیەت بێ ئەوا لای هەموو خاوەن ویژدانێك ئاشکرایە کە تەنها ئەو کەسانە تاوانباردەکرێن و بەر لەعنەتی ڕۆژگار دەکەون، نەك ڕێبازو بیرو فەلسەفە" نازانم ئەوانەی بە ناوی ئایین باسی ئینسانیەت و مرۆڤایەتی دەکەن، دەبێ مەبەستیان چی بێ؟ ئەگەر مەبەستیان هاوجۆری و هاونەوعیە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی بیروڕاو ئایین و ڕەنگ، وەك خەڵك وای تێدەگاو بەم واتایەش بەکاردێ، ئەوا ئەوانە زۆر دوورن لە ئیسلام و دیارە هەر لە خەیاڵی خۆیاندا واتایەکی تایبەتی و یاسایەکی خەیاڵاویان بۆ ئیسلام داناوە، چونکە ئیسلام ئەو کەسەی بڕوای پێنەهێنێ و ملکەچ نەبێ بۆی بە چاوێکی تر سەیری دەکاو ڕەفتاری لەگەڵ دەکا، ئەگەر وەك نووسەر لە خەیاڵی خۆی دایناوە وابووایە کچ و ژنی ناموسوڵمان بە دیل و تاڵان نەدەبران و نەدەکران بە کەنیزەك و منداڵە نێرینەکانیش نەدەکران بە کۆیلە، کە ئەمانە بە پێی دەقی قورئان جێبەجێ کراون، چونکە ئیسلام کە خوا ناردوویە پێویستە بە خۆشی بێ یا بە ترشی بڵاوبکرێتەوەو ئەوەی بڕوای پێ نەکردبێ و نەبووبێتە ئیسلام شەڕی لەگەڵدا کراوەو کوژراوەو سەروماڵ و ساکان و منداڵ و ژنی بە دەسکەوت و تاڵان گیراوەو بەسەر موسڵماناندا دابەشکراوەو منداڵەکانیشی کراوون بە کۆیلەو عەبد، ژن و کچەکانیشیان کراوون بە کەنیزەك و جاریە، خۆ ئەگەر ناموسوڵمانان شەڕیان نەکردبێ خۆیان هاویشتبێتە ماڵی موسوڵمانان و تەسلیم بووبن بەبێ شەڕ، ئەوا دەبوو بە سەرشۆڕی سەرانە بدەن وەك لە قورئاندا هاتووە لە سورەتی ئەلئەحزاب ئایەتی (26 و 27) کە دەڵێ (و انزل الذین ظاهروهم من اهل الکتاب من صیاصیهم و قذف في قلوبهم الرعب فرقا تقتلون و تأسرون فریقا و اورثکم ارضهم و دیارهم و اموالهم و ارضا لم تطؤها و کان الله علی کل شيء قدیرا) واتە خودا ئەو دەستەیەی خاوەن کیتابی کە پشتیوانیان لە موشریکان دەکرد لە سەنگەرو پەناگاکانیان و لە پایگاکانیان هێنایە دەرێ و ترس و لەرزی ئێوەی موسوڵمانی هاویشتە دڵیان تا وایلێهات ئێوەی موسوڵمان هەندێکیان بکوژن و هەندێکیان بە دیل بگرن و خودا سەروماڵ و زەوی و خانووبەرەی ئەوانی دا بە ئێوەو ئێوەی کردە میراتگری ئەوان هەروەها زەویەکی دا بە ئێوە کە جێپێتانی لێنەبووە.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەڵێ (و قاتلوا في سبیل الله الذین یقاتلونکم) وە لە شوێنێکی تردا دەڵی (و اقتلوهم حیث ثقفتموهم) و (و قاتلوهم حتی لاتکون فتنة و یکون الدین لله) ئایەتی (190، 191، 193) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا، واتە لە ڕێگەی خوادا بجەنگن لە دژی ئەوانەی شەڕتان لەگەڵدا دەکەن. لەگەڵ کافران بجەنگن و بیانکوژن لە هەر جێگەیەك دەستتان کەوتن. دژ بە کافران بجەنگێ تا فیتنەو فەساد لەسەر زەوی بەلا بدرێ و هەموو بێنە سەر دینی ئیسلام، لە ئایەتەکانی (216،224) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا دەڵێ (کتب علیکم القتال و هو کره لکم و عسی ان تکرهوا شیئا و هو خیر لکم.. و قاتلوا في سبیل الله) واتە جەنگتان لەسەر پێویست کرا کە بە دڵتان نییە، چەند زۆرە کە شت هەیە پێتان ناخۆشە بەڵام بۆ ئێوە چاکەی تیایەو خێرو خۆشی لە دوایە. لە ڕێگەی خوادا لەگەڵ کافران بجەنگن و بزانن کە خوا لە گوفتارو کرداری خەڵك ئاگاو بیسەرە.

"نازانم ئەوانەی بە ناوی ئایین باسی ئینسانیەت و مرۆڤایەتی دەکەن، دەبێ مەبەستیان چی بێ؟ ئەگەر مەبەستیان هاوجۆری و هاونەوعیە، بەبێ لەبەرچاوگرتنی بیروڕاو ئایین و ڕەنگ، وەك خەڵك وای تێدەگاو بەم واتایەش بەکاردێ، ئەوا ئەوانە زۆر دوورن لە ئیسلام و دیارە هەر لە خەیاڵی خۆیاندا واتایەکی تایبەتی و یاسایەکی خەیاڵاویان بۆ ئیسلام داناوە





ئایەتی (74–76) لە سورەتی ئەلنیساءدا دەڵێ (فليقاتل في سبيل الله الذين يشرون الحياة بالآخرة و من يقاتل في سبيل الله فيقتل او يغلب فسوف يؤتيه اجرا عظيما. و ما لكم لا تقاتلون في سبيل الله و المستضعفين من الرجال و النساء و الولدان الذين يقولون ربنا اخرجنا من هذه القرية الظالم و اجعل لنا من لدنك وليا و اجعل لنا من لدنك نصيرا. الذين امنوا يقاتلون في سبيل الله و الذين كفروا يقاتلون في سبيل الطاغوت فقاتلوا اولياء الشيطان ان كيد الشيطان كان ضعيفا) واتە با لە ڕێگەی خوادا بجەنگن ئەو کەسانەی ژیانی دونیا بە ڕۆژی دوایی دەفرۆشن، هەر کەسێك لە پێناوی خوادا بکوژرێ یا سەرکەوێ لە دواڕۆژدا پاداشتێکی گەورەی دەدەینەوە. بۆ لە ڕێگای خوادا شەڕناکەن؟ لە کاتێکدا بێ دەسەڵاتەکان لە ژنو لە پیاوو منداڵ هاواردەکەنو دەڵێن خوایە لە دەستی ستەمکاری ئەم دینەمان ڕزگار بکەو لە لایەن خۆتەوە سەرکارێكو پەنادەرێکمان بۆ بنێرە. ئەوانەی خاوەن بڕوان لە ڕێگەی خوادا دەجەنگنو ئەوانەی بڕوایان نییە لە ڕێگەی تاغوت دەجەنگن، بجەنگن دژی لایەنگرانی شەیتانو پیلانی شەیتان کزو لاوازە.

هەروەها لە سورەتی ئەلنیساء ئایەتی (84)دا دەڵێ (فقاتل في سبيل الله لا تكلف الا نفسك و حرض المؤمنين عسى الله ان يكف بأس الذين كفروا و الله اشد بأسا و اشد فتنة و يكون الدين لله كله) وە لە ئایتی (60) لە هەمان سورەتدا دەڵێ (و اعدوا لهم ما أستطعتم من قوة.. الخ) وە ئایەتی (65) لە هەمان سورەتدا دەڵێ (يا ايها النبي حرض المؤمنين على القتال) واتە لە پێناوی خوادا شەڕ بکە، ئەرکەکە بخەرە سەرشانی خۆتو موسوڵمانانیش هاندە شەڕبکەن دژی کافرانو ناموسوڵمانان، بێگومان خوا دەسەڵاتی کافرانت لێ دوور دەخاتەوەو خوایش لەوان بە دەسەڵاتترو تواناترو لەناوبەرترە. شەڕیان لەگەڵدا بکەن تا نەبنە فیتنەو دینیش هەموو بۆ خوا بێ. چیتان لەدەست دێ هێزو تواناو ڕاهێنانی وڵاخی بەرزە بیکەن ئامادەی بکەن. ئەی پەیامبەر موسوڵمانان هاندە با شەڕ لەگەڵ ناموسوڵمانان بکەن.

ئایەتی (67) لە سورەتی ئەلئەنفالدا دەڵێ (ما كان للنبي ان يكون له اسرى حتى شخن في الارض، تريدون عرض الدنيا و الله يريد الآخرة) واتە بۆ هیچ پێغەمبەرێك ڕەوا نیە کە دیلی هەبێو بەرەڵایان بکا بە بەدەڵی ماڵی دونیایی تا زەوی ڕەباس نەکا بە خوێنی ناپاكو ناموسوڵمان، ئێوە ماڵی دونیاتان دەوێو خواش مانی هەتاهەتاییو خۆشییەکی لە بن نەهاتوو. وە لە ئایەتی (69)ی هەمان سورەتدا دەڵێ (فكلوا مما عنمتم حلالا طيباً) واتە هەرچی بە تاڵانی جنگتان کەوت بیخۆن وەك گوێزو مازوو لێتان حەڵاڵە نۆشی گیان. هەروا لە ئایەتی (41)ی هەمان سورەتدا دەڵێ (و اعلموا انما غنمتم من شيء فان الله خمسه و للرسول و لذى القربى و اليتامى و المساكين و ابن السبيل.. الخ) واتە ئەی موسوڵمانان پێنج یەکی هەر تاڵانییەك کە دەستتان دەکەوێت بۆ خواو پێغەمبەرو خزمو کەسو کارتانو بێباوكو بێدەرەتانو ڕێبوارانە بە هەمان شێوە لە سورەتی ئەلتەوبە ئایەتی (5)دا دەڵێ (فاذا انسلخ الأشهر الحرم فأقتلوا المشركين حيث وجدتموهم و خذوهم و احصروهم و اقعدوا لهم كل مرصد فان تابوا و اقاموا الصلاة و آتوا الزكاة فخلوا سبيلهم..) واتە پاش ئەوەی مانگەکانی حەرام کە (ذي القعيدة، ذي الحجة، محرم، رجب)ە تێپەڕبوونو بەسەرچوون، بت پەرستان بکوژن لەهەر شوێنێ چنگتان کەوتن، بیانگرن گەمارۆیان بدەنو لە هەموو لایەك بۆسەیان بۆ دانێن، ئەگەر پاشگەزبوونەوەو تۆبەیان کردو نوێژیان کردو زەکاتیاندا ڕێگەیان بەردەنو ڕێگایان پێمەگرن.

لە ئایەتی (14) لە سورەتی ئەلتەوبەدا دەڵێ (و قاتلوهم يعذبهم الله بأيديكم و يخزهم و ينصركم عليهم و يشف صدرو قوم المؤمنين) واتە شەڕیان لەگەڵدا بکەن خوا بە دەستی ئێوە ئازاریان دەداو سەرشۆڕیان دەکاو ئێوەیان بەسەردا زاڵ دەکاو دڵی ئیماندارانیان پێ خۆشو گەش دەکات. ئایەتی (28–29) لە هەمان سورەتدا (يا ايها الذين آمنوا انما المشركون نجس فلا يقربوا المسجد الحرام بعد عامهم هذا و ان خفتم عليه فسوف يغنيكم الله من فضله.. قاتلوا الذين لا يؤمنون بالله و اليوم الآخر و لا يحرمون ما حرم الله و رسوله و لا يدينون دين الحق من الذين اتوا الكتاب حتى يعطوا الجزية عن يد و هم صاغرون) واتە ئەی موسوڵمانان بت پەرستان پیسن با نزیك مزگەوتی گەورە –حەرام– نەبن پاش ئەمساڵیان، ئەگەر لە هەژاریو کەم دەستی دەترسن خوا بە لوتفی خۆی دەوڵەمەندو تێرتان دەکات، شەڕبکەن لەگەڵ ناموسوڵمانان کە خاوەن کتێبنو نابنە موسوڵمانو بڕوا بە خواو ڕۆژی دوایی ناهێنن ئەوەی خواو پێغەمبەری خوا قەدەغەیان کردووە ئەوان قەدەغەی ناکەن پێی لێدەخشێنن، بیانکوژنو شەڕیان لەگەڵدا بکەن تا بەسەرشۆڕیو دەستبەدەست سەرانە دەدەن.

ئایەتی (110) لە سورەتی ئەلتەوبەدا دەڵێ (ان الله اشترى من المؤمنين اموالهم انفسهم بان لهم

- واتە ئەی موسوڵمانان پێنج یەکی هەر تالانییەك کە دەستتان دەکەوێت بۆ خواو پێغەمبەرو خزمو کەس و کارتانو بێ باوكو بێ دەرەتانو ڕێبوارانە
- واتە شەڕیان لەگەڵدا بکەن خوا بە دەستی ئێوە ئازاریان دەداو سەرشۆڕیان دەکاو ئێوەیان بەسەردا زاڵدەکاو دڵی ئیماندارانیان پێ خۆشو گەش دەکات

الجنة يقاتلون في سبيل الله فيقتلون و يقتلون وعدا عليه حقا في التوراة و الانجيل و القرآن و من اوفى بعهده من الله فاستبشروا ببيعكم الذي بايعتم به و ذلك هو الفوز العظيم) واتە خوا سەروماڵی لە موسوڵمانان کڕیوە بەوەی بەهەشتیان دەداتێ کە لە ڕێگەی خوادا خەبات بکەن و بجەنگن چ بکوژن چ بکوژرێن ئەمە گفتێکی ڕاستی خودایەو لەسەریەتی لە تەورات و ئینجیل و قورئان کێ لە خوا باشتر گفتی خۆی جێبەجی دەکات کەوایە خۆشی لە خۆتان بەم کڕین و فرۆشتنەو ئەم مامەڵە کە ئەمە برەوێکی گەورەیە.

ئایەتی (34) لە سورەتی موحەممەدا دەڵێ (فلا تهنوا و لا تدعوا الى السلم و انتم الأعلون و الله معكم و لن يتركم اعمالكم) واتە سست مەبن نزمی مەکێشن و داوای ئاشتی و شەڕ ڕاگرتن مەکەن کە ئێوە سەرکەوتوون خواتان لەگەڵدایە.

ئەوەی ڕابوورد کەمێك بوو لە زۆر لەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز کە پێغەمبەرو موسوڵمانان هاندەدا بجەنگن و شەڕ لەگەڵ ناموسوڵمانان و بتپەرستاندا بکەن و بە زۆرو تۆپزی بیانکەنە موسوڵمان یان ئەوەتا بە ملکەچی و سەرشۆڕی دەستبەدەست سەرانە بدەن، ئەمانە ڕەفتاری ئیسلامەتی بوو لەگەڵ بیانی و ناخزم و کەس وکار جا با بزانین ڕای ئیسلام بەرامبەر بە خزم و کەسوکاری ناموسوڵمان چییە؟

ئایەتی (23–24) لە سورەتی ئەلتەوبەدا دەڵێ (یا ايها الذين آمنوا لا تتخذوا آبائكم و اخوانكم اولياء ان استحبوا الكفر على الايمان و من يتولهم منكم فأولئك هم الظالمون. قل ان كان آبائكم او أبنائكم او اخوانكم او ازواجكم او عشيرتهم او اموال اقترفتموها او تجارة تخشون كسادها او مسكن ترضونها احب اليكم من الله و رسوله و جهاد في سبيل فتربصوا حتى يأتي الله بأمره و الله لايهدي القوم الفاسقين) واتە ئەی ئیمانداران دۆستایەتی لەگەڵ باوك و براتان مەکەن ئەگەر کافریان هەڵبژاردو نەبوونە موسوڵمان و هەرکەسێ لە ئێوە خۆشیانی بوێ ئەوانە ستەمکارن، ئەی پێغەمبەری ئێمە بە موسوڵمانان بڵێ ئەگەر ئێوە باوك و کوڕو براو ژن و عەشرەت و ماڵێك کە بەسەریەکتەوە ناوەو ترسی کەمبوونی بازرگانی و خانووێك کە پێی دڵخۆشن خۆشترتان دەوێ لە خواو پێغەمبەرو خەباتکردن لە ڕێگەی خوا ئەوا چاوەڕوانبن تا خوا فەرمانی خۆی جێبەجێ دەکاو خوا هەرگیز ڕێپیشاندەری کافرو فاسق ناکات.

ئایەتی (123) لە سورەتی ئەلتەوبەدا دەڵێ (یا ايها الذين آمنوا قاتلوا الذين يلونكم من الكفار و ليجدوا فيكم غلظة) واتە ئەی موسوڵمانان شەڕ لەگەڵ نزیکترین کەسی خۆتانی کافر بکەن و خەبات بکەن تا هێزو تواناو دەسەڵاتداری و توندیتان لێ بەدی بکەن. ئایەتی (22) لە سورەتی ئەلموجادەلە (لا تجد قوما يؤمنون بالله و اليوم الآخر يوادون من حاد الله و رسوله و لو كانوا آبائهم او ابنائهم او اخوانهم او عشيرتهم اولئك كتب في قلوبهم الايمان و ايدهم بروح منه و يدخلهم جنات تجرى من تحتها الانهار خالدين فيها رضي الله عنهم و رضوا عنه اولئك حزب الله الا ان حزب الله هم المفلحون) ئەی پێغەمبەر هەرگیز خەڵکێك نادۆزیەوە کە بڕوایان بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ و دۆستایەتی لەگەڵ دوژمنانی خواو پێغەمبەری بکەن، هەرچەند ئەو دوژمنانە باوك و کوڕو براو خزم و کەسوکاری خۆیان بن، ئا ئەمانە کە خوا ئیمانی لە دڵ چەسپاندون و یارمەتیان دەداو بەهەشتی پان و بەرینیان خەڵات دەکات کە هەتاهەتایە تێیدا دەژین و خوا لێیان دڵخۆشەو ئەوانیش بەخوا دڵخۆشن و ئەوانە حیزبی خوان و هەر حیزبی خواش سەرکەوتوو و بەهرە بەرە.

ئایەتی (73) لە سورەتی ئەلتەوبەدا دەڵێ (یا ايها النبي جاهد الكفار و المنافقين واغلظ عليهم ومأواهم جهنم و بئس المصير) واتە ئەی پێغەمبەر جیهادی کافرو مونافیقان بکەو لەگەڵیان توند بە ئەوان جێگەیان دۆزەخەو خراپترین چارەنووسە. ئەمە قورئان و کردارو ڕەفتارو گوفتاری پێغەمبەریش (د.خ) دەربارەی ناموسوڵمان و بتپەرستان بەم جۆرە بووە.

حەدیسی سەحیحی موسلیم لاپەڕە (53) ژمارەی حەدیس (36) دەڵێ (حدثنا ابو غسان المسمعي مالك بن عبدالواحد حدثنا عبدالملك بن الصباح عن صعبة عن واحد بن محمد بن زيد بن عبدالله بن عمر عن ابيه عن عبدالله بن عمر قال، قال رسول الله (ص) امرت اقاتل الناس حتى يشهدوا ان لا اله الا الله و ان محمدا رسوال الله و يقيموا الصلاة و يؤتوا الزكاة فاذا فعلوا عصموا مني دمائهم و اموالهم الا بحقها و حسابهم على الله.

واتە پێغەمبەر (د.خ) گوتویەتی فەرمانم پێکراوە کە لەگەڵ خەڵکی بجەنگم تاوەکو بڕوادێنن بە خواو پێغەمبەرو نوێژکردن و زەکات دەدەن، ئەگەر ئاوایان کرد خوێن و سامانیان دەپارێزرێ جگە لەوەی کە بە حەق لێیان دەسەنرێ.

ئەوەی ڕابوورد کەمێك بوو لە زۆر لەو ئایەتانەی قورئانی پیرۆز کە پێغەمبەرو موسوڵمانان هاندەدا بجەنگن و شەڕ لەگەڵ ناموسوڵمانان و بتپەرستاندا بکەن و بە زۆرو تۆپزی بیانکەنە موسوڵمان






ئەو كەسەی بڕوای بە ئیسلام نەهێنابێ‌و نەبووبێتە موسوڵمان وەك نەیارو دوژمن تەماشا كراوە با خزم‌و جا كەسوكارو باوك‌و براو كوڕی موسوڵمانان بن

دیسان لە جزمی سێیەمی سەحیحی موسلیم لاپەڕە (1517) ژمارەی حەدیس (1910) دەڵێ (حدثنا ابن عبدالرحمن ابن سهم الأنطاكي اخبرنا عبدالله بن المبارك عن و هيب الملكي عن عمر بن محمد المنكدر عن سمى محمد ابن صالح عن ابي هريرة قال، قال رسول الله (ص) من مات و لم يغز و لم يحدث به نفسه مات على شعبة من نفاق).

واتە پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی هەركەسێ بمرێ‌و خەزای نەكردبێ یا بە دڵیدا نەهاتبێ خەزا بكا، دەمرێ لەسەر جۆرێك لە جۆرەكانی دووڕوویی. ئا ئەمەیە پوختەی پەیوەندی نێوان موسوڵمان‌و ناموسڵمان‌و ئایەت‌و حەدیسی تر گەلێ زۆرن لەم بابەتانە بەلام بۆ بەڵگە ئەمەندەمان بەسە.

جا ئەوانەی ئایەتەكان باسیان لێوەدەكا فەرمان بە كوشتن‌و بڕینیان دەدا هەر لە هۆزی عەرەب بوون‌و خزم‌و كەسوكاری موسوڵمانەكانی عەرەب بوون‌و لەبەرئەوەی نەبوون بە ئیسلام قورئان ئاوا سەروماڵیانی بۆ موسوڵمانەكان حەلاڵ كردووەو كچ‌و ژنیشیان بكەن بە كەنیزەك‌و جاریە هەتا ئەو ژنانەی كەوا مێردیشیان هەبووە لە شەڕدا هەلاتوون چنگ نەكەوتوون ژنە بە مێردەكانی بە تالان گیراو بۆ موسوڵمانان حەلاڵ بووە كە وەك ژنی خۆیان ڕەفتاریان لەگەڵدا بكەن‌و بیانكەنە كەنیزەك‌و خۆشیان لێ بچێژن‌و نێرینەكانیش بكەن بە كۆیلەو عەبد.

ئیدی نازانم ئەم جۆرە نووسەرانە بە چ ڕوویێكەوە دەڵێن (هەرچی پەیوەندی لە دوورەوە یا لە نزیكەوە بە چەوساندنەوەی ئینسانەوە هەیە پوچەڵ دەكاتەوە، هەر ئەمیش بە جوانترین شێوە دەیەوێ بەرگری لە ژیانی بە خۆشی پێكەوەژیانی مرۆڤایەتی بكا جا ئەگەر لە هەر شوێن‌و كاتێكدا بە هۆی هەندێ كۆلكە مەلاو دوژمن شەریعەتەوە كاری وا كرابێ پێچەوانەی خزمەتی ئینسانیەت بێ ئەوا لای هەموو خاوەن ویژدانێك ئاشكرایە كە تەنها ئەو كەسانە تاوانبار دەكرێن‌و بەر لەعنەتی ڕۆژگار دەكەون نەك ڕێبازو بیرو فەلسەفە).

ئەوانە شەرم لە خۆیان ناكەن كە درۆ بە زمانی ئیسلام دەكەن‌و وا دەكەن كە خەڵك دووربكەونەوە لە مەبەستی ئیسلام‌و ئیسلامەتی، ئیسلام وەك بەرنامەو بیروباوەڕێك بۆیە هاتووەو خوا ناردوویە كە بلاوبێتەوە بە خۆشی یا بە زۆر وەك لەو هەموو ئایەتە قورئانیانەی پێشەوە دەركەوت‌و هەروەهاش لە ڕەفتارو كردارەكانی پێغەمبەر (د.خ) و جێگیرەكانی كە چوار یارەكەن.

جا بە كورتی: ئەو كەسەی بڕوای بە ئیسلام نەهێنابێ‌و نەبووبێتە موسوڵمان وەك نەیارو دوژمن تەماشا كراوە، جا با خزم‌و كەسوكارو باوك‌و براو كوڕی موسوڵمانان بن، ئیسلام دان بەو مەفهومە ئینسانییەی ئەو جۆرە نووسەرانە بۆی دەچن نانێن، بەڵكو ئیسلام مرۆڤ دەكاتە دوو بەش موسوڵمان‌و كافرو نەیار، جا ئەوانەی موسڵمانیشن دەیانكاتە دوو چین، چینی ئازادو چینی كۆیلەو عەبد، هەریەكە لەم دوو چینە حوكمێكی تایبەتی خۆی هەیە بۆ نمونە چینی موسوڵمانی نائازاد وەك كەنیزەك‌و جاریە ئەگەر لەبەر پێویستی‌و ترسی تووشی گوناح بوون نەبێ هێنانی وەك ژن بۆ پیاوی ئازاد ڕاست و دروست نییە، چونكە ئەو منداڵەی دەیبێ كۆیلەیە ئەم قسەیەش بە پێی ئایەتی (25) سورەتی ئەلنیساء كە دەڵێ (و من لم يستطع منكم ان ينكح المحصنات المؤمنات فمما ملكت ايمانكم من فتياتكم المؤمنات.. و ان تصبروا خير لكم). بە واتای ئەگەر كەسێك لە ئێوەی موسوڵمان توانای مارەدان‌و هێنانی ژنێكی موسوڵمانی ئازادی نەبوو، با لەو كەنیزەكە موسوڵمانانە بێنێ كە بە دیلی‌و تالانی چنگتان كەوتوون، خوا دەزانێ‌و باشتر دەتانناسێت. كەنیزەكەكان بە پرسی گەورەو خاوەنەكانیان مارە بكەن‌و مارەیشیان بە چاكی‌و بە تەواوی بێ كەمی بدەنێ، ئەوانیش پێویستە داوێن پاك بن‌و خۆ دوور بگرن لە داوێن پیسی‌و لە ژێرەوە بە نهێنی دۆست نەگرن، كاتێك كە بوونە مێرددار ئەگەر كارێكی ناپاكیان لێ ڕوویدات‌و داوێن پیسیان كرد، ئەوا سزایان نیوەی سزای ژنێكی ئازادە لە كارێكی وەهادا. هێنانی كەنیزەكیش بۆ كەسێكە كە بترسێ لەوەی تووشی گوناح بێ دەنا ئەگەر ئارام بگرن‌و كەنیزەك نەهێنن باشترە.

لە بیروڕای ئیمامی شافیع (خ.ل) ئەم ئایەتە بەڵگەیەكە هێنانی جاریەی موسوڵمان وەكو ژن بۆ پیاوی ئازاد حەرامە ئەگەر پیاو توانای مارەدانی ژنێكی ئازادی هەبێت. كەوایە ژن لە ڕوانگەی ئیسلامەوە دوو حوكمی هەیە یەكێكیان بۆ ژنێك كە بە تالان دەست كەوتووە، حوكمەكەشی ئەوەویە كە دەكڕدرێن و دەفرۆشرێن بێ مارە بڕین، كڕیار دەتوانێت سوودو كەڵكیان لێوەربگرێت لە هەموو ڕوویەكەوە تەنانەت لە ڕووی ئارەزووی لەشییەوە.

کەنیزەك (جاریە) ئەو ژنانەن کە لە شەڕی دوژمنانی ئیسلام بە دیل و تالآنی دەستکەوتوون و گیراوون، ئەو ژنانەش بە مێردبن و مێردەکانیان لە ژیاندا مابێ یا کوژرابێ فەرق ناکا بۆ کڕین و فرۆشتنیان و لەگەڵ ڕابواردنیان، چونکە بە ڕای ئیسلام ئەو ژنە بە مێردانەی بەدیل و تالآنی دەگیرێن کرێی مارەییان لادەچێ بە بوونیان بە دیل، هەروەهاش کەنیزەك هیچ هەقی پرس و ڕا وەرگرتنیان نییە، نە بۆ کڕین نە بۆ فرۆشتن وەوکو هەر ماڵ و کوتاڵێك کە دەکڕدرێ و دەفرۆشرێ، ئەمە دەربارەی ژنی بە تالآن دەستکەوتوو، کەنیزەك واتە ژنی نائازاد. ژنی نازادیش ئەو ئافرەتانانەن کە کەنیزەك نەبوون و بە تالآن نەگیراون بە خۆشی خۆیان بوون بە موسوڵمان، ئەوانیش نە تەلاقیان بە دەستەو نە پرسیان پێدەکرێ بۆ تەلاق دانیان لە مارەبڕین و بەشوودانیش وەك واجیب پرسیان پێناکرێ (وەلی موجبیر) واتە سەرداری سەپێنەر ئەم سەرداره دەتوانێ کچی خۆی لەسەر لانکە مارە بکا لە هەر کەسەی بیەوێ بگرە کچی عازەبیش کە خۆی ناسیوەو گەیشتوەتە تەمەنێك کە چاکەو خراپە لێك جیابکاتەوە، باوك دەتوانێ بە بێ پرس مارەی بکا لە هەر کەسێ بیەوێ بە مەرجی لە نێوان باوك و کچەدا هیچ ناخۆشییەك و ناحەزیەك نەبێ، بە دەربڕینێکی تر، باوك بەرژەوەندی کچەکەی ڕەچاو کردبێ و مەبەست لە بەشوودانی تۆڵەسەندن و ئازاردانی کچە نەبێ، مارەبڕینی کچی منداڵی سەر لانکە کە چاکەو خراپە لێك جیاناکاتەوە هەر بەدەست باوکە لە مەزهەبی ئیمامی شافیعیدا (خ.ل) زۆر ڕوون و ئاشکرایەو دروستە بە بێ هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك، ئەوەی کێشەی لەسەرە کە ئایا دروستە یان نادروستە یا بڵێین باوك ناتوانێ مارەی بکا یا لێی مارە بکا بار "حەمل"ی ژنەکەیەتی وەك بڵێی (کچ بوو) فلانەکەش بڵێ (باشە قبوڵمە) مارەییەکە نابێ و ئیجاب و قبوڵەکە بەتاڵە، چونکە نازانرێ ئەو سکە چییە؟ کوڕە یان کچە، لێرەدا ئەم جۆرە مارەکردنە دەبێتە مارەی بێ مەرج و ئەمەش نادروستە خۆ ئەگەر بە هۆی ئامرازێکی ئەلەکترۆنی بزانرێ سکەکە چییە هەر لە یەکەم چرکەی تەلقیحەوە

باوك حەقیەتی بە مێردی بداو مارەی بکا، بەڵگەی ئیمامی شافیعی بۆ ئەم ڕایە کە باوك دەتوانێت کچی خۆی بێ پرس لە هەرکەسێ بیەوێ مارە بکاو مارەی دەکا ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەرە (د.خ) کە دەفەرموێ (الثیب احق بنفسها من ولیها و البكر یزوجها ابوها) واتە بێوەژن بە خۆی لە پێشترە لە سەردارەکەی و کچ باوکی مارەی دەبڕێ، هەروەها قسەی عائیشە (خ.ل) کە دەڵێ پێغەمبەر (د.خ) لە شەش ساڵیدا مارەی کردم و لە نۆ ساڵیدا گوازتمیەوەو لە هەژدە ساڵیمدا بەجێی هێشتم و کۆچی دوایی کرد. تەلاقدانیش هەر بەدەست پیاوەو ژن بە هیچ جۆرێك مافی ئەوەی نییە پرسی پێبکرێ کە ئایا تەلاق بدرێ یان نا. هەرچی ئایەتی قورئان هەیەو هاتووە دەربارەی تەلاقدان خوا ڕووی لە پیاو کردووەو تەنها مافێك بۆ ژن هەبێت مارەیی و نانداتە. لە مەسەلەی تەلاقدان ئایەتی (1−3) لە سورەتی ئەلموجادەلە زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە دەڵێ (قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجه و تشتكي الى الله و الله یسمع تحاورکما ان الله سمیع بصیر. الذین یظاهرون منکم من نسائهم ماهن امهاتهم ان امهاتهم الا اللآئي ولدنهم انهم لیقولون منکرا من القول و زورا ان الله عفو غفور).

واتە خوا گوێی لە قسەی ئەو ژنە بوو کە وتوێژی لەگەڵ دەکردی و سکاڵای لەلای خوا دەکرد وە خوا گوێی لە وتوێژەکەتانەو خوا بیسەرو بینایە. ئەوانەی (زیهار) دەکەن لە ئێوە لە ژنەکانیان ئەوان دایکیان نین بەڵکو دایکیان ئەوانەن کە هێناونیانەتە دنیاوە ئەوەی دەیڵێن قسەی خراپەو ناڕەزایەو خوا لێبوردەو بەخشندەیە. وشەی (زیهار) لە شەرعدا ئەوەیە کە پیاو ئەندامی لەشی ژنی خۆی بە ئەندامی لەشی دایکی خۆی وێك بچێنێ وەك بە ژنەکەی بڵێ "پشتت وەکو پشتی دایکمە" مەبەستیش لێحەرام بوون و تەلاقە. وەك لە تەفسیری بەیزاوی دەڵی ئەم ئایەتە دەربارەی (خەولە) کچی (سوعلەبە) هاتووەتە خوارێ، کە مێردەکەی (ئەوسی) کوڕی (ئەلسامیت) وازی لێهێنابوو بەو زیهارە ژنەکەیشی (خەولە) چووبووە لای پێغەمبەر (د.خ) داوای ڕێگایەکی لێکردبوو و پێغەمبەریش (د.خ) فەرمووبووی لێی حەرام بووی، ژنەکە گوتبووی خۆ تەلاقی نەداوم،

کەنیزەك (جاریە) ئەو ژنانەن کە لە شەڕی دوژمنانی ئیسلام بە دیل و تالآنی دەستکەوتوون و گیراوون، ئەو ژنانەش بە مێردبن و مێردەکانیان لە ژیاندا مابێ یا کوژرابێ فەرق ناکا بۆ کڕین و فرۆشتنیان و لەگەڵ ڕابواردنیان





نازانم ئەو جۆرە نووسەرانە پشتیان لە کام بنەڕەت لە بنەڕەتەکانی ئیسلام بەستووە کە بە ناوی ئایینی ئیسلامەوە ئەوەی ڕژێمەکانی هاوچەرخ و ئەم سەردەمە دەربارەی ژنیان نووسیوەو داناوە بڵاوی دەکەنەوەو بە مل دینی ئیسلامیدا دەبڕن

پێغەمبەر (د.خ) فەرمووبووی لێی حەرام بووی ئەوجا ژنەکە زۆر خەمبار بوو لەبەرئەوەی منداڵی وردو بچوکی هەبوون و نەیدەزانی چ بکاو هیچی بۆ نەمایەوە جگە لەوەی ڕوو لە خوا بکاو کاری خۆی پێ بسپێرێ، ئەنجا ئەم ئایەتە هاتە نووسین دەربارەی تەڵاقدان و چۆنیەتی مافی ژن، ئایەتی قورئان زۆرن لە بارەی تەڵاقدان، لە پاشان لە شوێنی خۆی بە درێژی باسی لێوە دەکەین دەیانخەینە بەرچاو. ئەوجا ژن وانییە هەر لە مارەبڕین و تەڵاقدان وا تەماشا بکرێ، بەڵکو لە هەڵسووڕاندنی کاروبارو خوێن و بەشە میراتیش نزمتر لە پیاو تەماشا دەکرێن وەك لە قورئاندا هاتووە ئایەتی (11) سورەتی ئەلنیساء (یوصیکم الله في اولادکم للذکر مثل حظ الانثیین) واتە دەربارەی دابەشکردنی میرات لە نێوان منداڵتاندا خوا فەرمانی ئەوەیە کە نێر دوو ئەوەندەی مێ دەبا، یانی دوو بەش بۆ کوڕو بەشێك بۆ کچ. ئایەتی (176) لە هەمان سورەتدا دەڵێ (و ان کانوا اخوة رجالا و نساء فللذکر مثل حظ الانثیین یبین الله لکم ان تضلوا و الله بکل شيء علیم) واتە لە دابەشکردنی میراتدا میراتگر ئەگەر خوشك و برا بوون ئەوا بۆ نێر بە ئەندازەی بەشی دوو مێیە. ئاوا خوا بۆتان دیاریدەکات بە هەڵە نەچن. ئایەتی (24) لە هەمان سورەت دەڵێ (الرجال قوامون علی النساء بمال فضل الله بعضهم علی بعض و بما انفقوا من اموالهم.. الخ) واتە پیاو سەرکارو سەرداری ژنانن لەبەرئەوەی خوا هەندێکی گەورەتر کردوە لە هەندێکی ترو لەبەرئەوەش کە پیاو مارەیی دەدەن. ئەم ئایەتە ڕوون و ئاشکرایە لەوەی کە پیاوی کردووەتە سەردارو کاربەدەست. ئایەتی (228) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا (و لهم مثل الذي علیهن بالمعروف و للرجال علیهن درجة) واتە مافی ژنان بەو ئەندازەیە کە لە سەریانەو پیاویش پلەیەك لەسەروی ئەوانەوەن. پێغەمبەریش (د.خ) دەڵێ (الدنیا متاع و خیر المتاع الدنیا المرأة الصالحة) واتە جیهان کوتاڵەو چاکترین کوتاڵیش ژنی چاکە.

جا ئەمەیە مافی ژن، نازانم ئەو جۆرە نووسەرانە پشتیان لە کام بنەڕەت لە بنەڕەتەکانی ئیسلام بەستووە کە بە ناوی ئایینی ئیسلامەوە ئەوەی ڕژێمەکانی هاوچەرخ و ئەم سەردەمە دەربارەی ژنیان نووسیوەو داناوە بڵاوی دەکەنەوەو بە مل دینی ئیسلامیدا دەبڕن، کە ئایینی ئیسلام زۆر لێیانەوە دوورەو بە هیچ جۆر یەکێك خۆی بە موسوڵمان بزانێ و ئەو جۆرە حوکمانە بەسەر ئیسلامدا دانابڕێ، چونکە ئیسلام ناگۆڕێ و هەرکەس بیگۆڕی ئەگەر لە نەزانی بێ دەبێ پاش زانین پاشگەز ببێتەوە داوای لێبوردن لە خواو ئیسلام بکات، ئەگەر بزانێ، بە ئەنقەست ئەو حوکمانە بگۆڕێ ئەوا دەکەوێتە بەر ئەم ئایەتە کە دەڵێ (و من لم یحکم بما انزل الله فاولئك هم الظالمون) واتە ئەوەی حوکم بە دەستووری ناردراوی خوا نەکا ئەوا زۆردارو ستەمکارە. چونکە ئایین گۆڕانی بۆ نییە، تەنها بە هاتنی ئاینێکی تری تازە نەبێ، وەگ گۆڕینی دینی جولەکە بە دینی مەسیحی و گۆڕانی دینی مەسیحی بە دینی ئیسلام، وە ئاینی ئیسلامیش نەگۆڕەو تا دنیا دنیایە هەر ئەم ئاینە دەبێ و هیچ پێغەمبەری تر نایەن، چونکە ئایەتی قورئان دەڵی پێغەمبەری ئیسلام دوا پێغەمبەرە کە لە سورەتی ئەلئەحزابدا دەڵێ (ماکان محمد ابا احد من رجالکم و لکن رسول الله و خاتم النبیین و کان الله بکل شيء علیما) جا هەرکەسێك لە بارەی کۆمەڵایەتی و ژن و پیاوو مافیان و پەیوەندی خەڵك لەگەڵ یەکتری ڕای خۆی دەربڕی یا هەر ڕژێمێك پەسەند دەکا، لام وایە تا ئێستا کەس ڕێگەی لێنەگرتووەو ڕێگەی لێناگیرێ، بەڵام نابێ بە ناوی پاکی ئیسلام بە خەڵکی بسەلمێنێ کە ئەو بیروڕایانە هی ئیسلامەو بە مل ئیسلامیدا بیڕێ. خولاسە تەلاق بە دەست پیاوەو ژن ئاگای لە تەڵاق دانەکە هەبێت یا نەبێ، تەڵاق دەدرێ و ناتوانێ تەڵاقەکەی ڕاگرێ، تەنها مافێکی ژن هەیبێ لێرەدا مارەییەو مافی ئەوەشی هەیە ستەمی لێنەکرێ، وەك تەڵاقی ڕەجعی بدرێ و پێش ئەوەی ماوەکەی تەواوبێ، پیاوە بگەڕێتەوەو جارێکی تر تەڵاقی بداتەوە بۆ ئەوەی مارەی چاوەڕوانی ژنە درێژ بکاتەوەو ئازاری ژنەکە بدا، واتا لە نێوان چاڵاو ماڵانی بهێڵێتەوە، کە نەتوانێ مێردێکی تر بکاتەوەو نە لە لای مێردیشی بێ، ژن مافێکی تریشی هەیە، ئەویش ناندانی پێی دەڵێن ئەگەر ژنە منداڵی

هەبوو منداڵەکەش لای ژنە مایەوە، هەرچەندە ئەو مافە هی منداڵەکەیە بەڵام ژنەش کەڵکی لێوەردەگرێ.

ژن کە لە تەڵاقدان وەك پیاو نییەو کارەکە بەدەست پیاوە، لە میرات گرتنیشدا نیو ئەوەندەی پیاو وەردەگرێ، باوك کە سەرداری ماڵەو دەسەڵاتدارە، دەتوانێ کچی خۆی چ گچکە و سەرلانکەو چ گەورە بێ پرس بە هەرکەسێ حەزبکا بداو مارەی ببڕێ، ژن ئەگەر لە کارێکدا لە فەرمانی مێردی بچێتەدەر واتە بە گوێی مێردی نەکا مێرد بۆی هەیە بۆ یەکەم جار ئامۆژگاری بکا لەگەڵی نەنوێ لە پاشان لێشی بدا، نا فەرمانییەکانی ژن بەرامبەر بە مێردی وەکو چوونە دەر لە ماڵ بە بێ پرس و بە قسەنەکردنی مێرد، یان مێرد داوای کارێك لە ژنەکەی بکاو ژنە ئەنجامی نەدا بەبێ بەهانەیەکی بەجێ، مێرد لەو کاتەدا هەقی هەیە بۆ یەکەمجار ئامۆژگاری بکا، پاشان لەگەڵی نەنوێ، ئەنجا لێی بدا، پیاو ئەگەر سوێند بە تەڵاق بخواو هیچ ناخۆشییەکیش لە نێوان خۆی و ژنەکەیدا نەبێ با منداڵیشیان هەبێ و منداڵەکانیش وردبن تەڵاقەکەی دەکەوێ، ئەگەر مێرد سوێندەکە لە خۆی نەخا. هەروەها دەبێ ژنی موسوڵمانی ئازاد لە دەرەوەی ماڵ بە چارۆکە خۆی داپۆشێ و جوانی لەش و لاری و خشڵ و ملوانکەو گوارەو لاسەرەو پاوانەی پێوەیە، وەك بە توندی بڕواو پێ لە زەوی بدا تا پاوانەکانی دەنگیان لێوە بێت یا لەگەڵ ڕۆشتندا سەری بەرزو نزم بکا، تا قویتاسەکانی زەنگ لێبدا، لە لایەکی ترەوە ژن لە ناو ماڵی خۆیشیدا ئەگەر کەسێکی وای لێبێ کە مەحرەم نییە، بە واتا ئەگەر ژنە مێردی نەبێ بەو کەسە بشێ بیخوازێ و مێردی پێبکا، دەبێ هەمان ڕەفتار کە لە دەرەوە دەکا، لە ماڵەوەش بیکا، یانی خۆی داپۆشێ و شوێنی نیشەبزوێنی دەرنەخا. ئەم حوکمانەش بە پێی ئایەتی قورئان گوفتارو کرداری پێغەمبەر (د.خ) بیروڕای ئیمامی شافیعی (خ.ل) کە مەزهەبی زۆربەی میللەتی کوردەو لە پاشان باسیان دەکەین.

جا ئەو کەسەی بڕواو ئیمانی بە ئایینی ئیسلام هەیە وەك ئایینێك کە لە خواوە لەسەر زەمانی موحەمەدی کوڕی عەبدوڵا (د.خ) هاتووەتە خوارێ بۆ چاکەی مرۆڤ، ئەوا پێویستە بەبێ هیچ پەناو پێچ و تەفسیرو تەئویل بەبێ گۆڕین بە پێی چەرخ و کات و سات، ئەم بڕوایانەو بەرنامەی ئیسلامە جێبەجێ بکاو ڕەفتاری پێبکاو لێی لانەداو هەوڵی گونجاندنی لەگەڵ بیرێکی تری جیاوازدا نەدا، یا لەگەڵ سەردەم و زەمانەدا، چونکە ئەو خوایەی ئەم ئایینەی ناردووە بە پێی بیری ئیسلام زەمانی بۆ نییە، واتە شتێك لە زانستی خوا بەدەر نییە پێش ئەوەی ڕوویداو تا دەبڕێتەوە، ئەمەش وا دەگەیەنێ گۆڕانی کۆمەڵ و پیشەسازی و پێشکەوتن و دواکەوتن و هەر گۆڕانێکی لەباری پیشەسازی و ئابووری و ڕامیاری و فیکری لە خوا بزرو ون نییە پێیان دەزانێ ئەو دروستی دەکاو کات و ساتی بەدەرکەوتنیان بۆ دیاریدەکا، ناردنی ئەو پێغەمبەرانەش لەبەرئەو گۆڕانانە نەبووە وەك هەندێ کەسی خوانەناس وا تێگەیشتووە، بەڵکو لەبەر نەتەوەکان بووەو خوا هەر پێغەمبەرێکی بۆ کۆمەڵێك خەڵك ناردووە لە سەردەمێکدا لەبەر هۆیەك کە تەنها خوا خۆی دەزانێ ئێمە تێی ناگەین هەر تەفسیرێکیش بکرێ دوورە لە ڕاستی بە تایبەت ئەگەر یەکێك بڵێ لەبەر گۆڕانی کۆمەڵ بووە ئەمەیان وەك ئیسلام دەڵێ کوفرەو لە ئایین بەدەرە.

چونکە ئایەتی قورئان لە سورەتی ئەلمائیدە دەڵێ (و انزلنا اليك الكتاب بالحق مصدقا لما بين يديه من الكتاب و مهيمنا عليه فأحكم بينهم بما انزل الله و لا تتبع اهوائهم عما جائك من الحق. لكل جعلنا منكم شرعة و منهاجا ولو شاء الله لجعلكم امة واحدة و لكن ليبلوكم في ما آتاكم فاستبقوا الخيرات الى الله مرجعكم فينبئكم فيما فيه تختلفون) ئایەتەکانی پێش ئەم ئایەتە باسی ناردنی تەورات و هەندێ حوکمی خوا لە تەوراتدا دەکاو ئەنجا باسی ئەوە دەکا کە مەسیحی ناردوە ئینجیلی بۆ ناردوونەتە خوارێ ئەنجا باسی ناردنی قورئان دەکاو دەڵێ ئێمە بە ڕاستی قورئانمان بۆ ناردی کە ئەو پەیمانانەی لە بەردەستدایە بە ڕاست دەزانێ و لەسەری زاڵە، جا نێوانیان بکە بەوەی خوا بۆتی ناردووەو دوای هەوەس و ئارەزووی ئەوان مەکەوە، بۆ هەریەك لە ئێوە ڕێگەیەك و بەرنامەیەکمان داناوە، ئەگەر خوا حەزی بکردایە ئێوەی هەموو بەیەك نەتەوەو کۆمەڵ و یەك ئایین دادەناو یەکی دەخستن، بەڵام

جا ئەو کەسەی بڕواو ئیمانی بە ئایینی ئیسلام هەیە وەك ئایینێك کە لە خواوە لەسەر زەمانی موحەمەدی کوڕی عەبدوڵا (د.خ) هاتووەتە خوارێ بۆ چاکەی مرۆڤ، ئەوا پێویستە بەبێ هیچ پەناو پێچ و تەفسیرو تەئویل بەبێ گۆڕین بە پێی چەرخ و کات و سات، ئەم بڕوایانەو بەرنامەی ئیسلامە جێبەجێ بکاو ڕەفتاری پێبکاو لێی لانەداو هەوڵی گونجاندنی لەگەڵ بیرێکی تری جیاوازدا نەدا





بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیەوە تاقیتان بکاتەوە، ئاوا بۆ هەریەکە بەرنامەیەکی تایبەتی دانا، دەست پێشکەری لە چاکەکردن بکەن، هەمووتان هەر بۆ لای خوا دەگەڕێنەوەو ئەوکاتە پێتان دەڵێ کە ناکۆکیەکەی نێوانتان چی بوو. بە پێی ئەم ئایەتە وەك ڕوونمان کردەوە ناردنی زۆر پێغەمبەر لەبەر گۆڕانی زەمان و کۆمەل نەبووەو لەلای خوا هەموو شتێك ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام بۆ ئەوەی کام کۆمەڵ و نەتەوە چاکتر بەرنامەکانی خوا جێبەجێ دەکەن، تا بەو پێیە پاداشت و چاکەیان بداتەوە، خۆ بێ ئەزمونیش دەزانێ کام کۆمەڵ و میللەت باشترە، بەڵام ئەمە کارێکە هەر خوا بۆ خۆی سەری لێدەردەچێ و مرۆڤ تا ئێستا نازانێ بۆ وایە. ئەگەر هەندێ کەس دەڵێن لەبەر گۆڕانی زەمان و کۆمەڵ بوایە چاوەڕوان دەکرا کە خوا دەرگای ناردنی پەیام و پێغەمبەری پێوە نەدەدا، چونکە لە نێوان هاتنی موساو عیسا (500—600) ساڵەو نێوان عیساو محەمەد (د.خ) (500—600) ساڵ بووە کەچی پاش موحەمەد (د.خ) خوا دەرگای ناردنی پەیام و پێغەمبەری تری داخست بۆیە لە قورئاندا دەڵێ دوا پێغەمبەرە لە (س) ئەلئەحزاب (ئا) 40.

جا وەکو وتمان هەموو گۆڕانێکی بیرو عادەت لە پێشەوە لای ئاشکرایە بۆیە هەر یاساو فەرمانێك بە زمانی پێغەمبەرێکەوە نێردرابێ تازە ئەو فەرمانە ناگۆڕدرێ و گۆڕانی تێدا ناکرێ تا خوای مەزن بۆ خۆی نەیگۆڕێ بە ناردنی پەیامێکی تازەو پێغەمبەرێکی تازە. جا بە گوێرەی ئایینی ئیسلام پەیام و پێغەمبەر دوایی هاتووەو تەواو بووە، ئیدی گۆڕانی نیەو چۆن هاتووە هەروا دەمێنێ، هەرچەندە سەردەم و چەرخ و گۆڕانی کۆمەڵ بۆیان بلوێ یان نەلوێ و لەگەڵ بارودۆخی ئەم زەمانەدا بگونجێ یا نەگونجێ. ئەگەر بگەڕێینەوە ڕۆژانی یەکەمی ئیسلام، دەبینین کات و سەردەم و کۆمەڵ ئەوکاتەش نەگونجاو بووە لەگەڵ ڕێڕەوی ئیسلام، ئیسلامیش بۆیە هاتووە ئەوە بگۆڕێ بە پێی ئەو حوکم و دەستوورو فەرمانانەی کە خوا لەسەر زاری موحەمەد (د.خ) هاتوون، لەبەر ئەمە پێشکەوتن و پاشکەوتن لە ئیسلامدا نییەو نابێ هەوڵی گۆڕان و گونجاندنی بدرێ، هەرکەس لە ڕووی نەزانییەوە بیەوی ئەمە گوناحبارەو دەبێ تەوبە بکا پاش پێزانینی، خۆ ئەگەر بشزانێ و بە ئەنقەست وا بکا ئەمە دژ بە ئاینی ئیسلامەو وەك کافر تەماشا دەکرێ، جا ئەگەر هەندێ بەناو مەلا بە پێچەوانەی فەرمانی خوا دەجوڵێنەوەو لە بۆ ماڵی دونیاو پایەو جێگەو ژیان دۆستایەتی لەگەڵ ئەو کەسانە دەکەن کە ڕێڕەوی شەیتانیان لا پەسەندەو ناوی خۆشیان ناوە مەلاو جێگری پێغەمبەر (د.خ) و نوێ کەرەوەی دین و مەلای عەسری و زەمانەو بە زمان دەڵێن "باوکم دین وا وشك نییەو وەکو ئەو خەڵکە دەڵێن" ئەوانە لە دین بە دوورن و مافیان بەسەر دینەوە نییەو دەیانەوێ بە ناوی عەسری و موتەحەڕیرەوە ڕێگە خۆش بکەن بۆ ئەوەی حوکمی ئایین نەمێنێ و ڕژێمی عیلمانی بێتە کایەوە، دەنا نە عەسری و نە موتەحەڕیر هەیە لە دینی ئیسلامدا ئەگەر موتەحەڕیر لێك بدەینەوە کە خۆی لە ئایینی ئیسلام ئازاد کردووەو خۆی پێ نەبەستووەتەوە ئەمەش وەك قورئان دەڵێ (یا ایها الرسول لا یحزنك الذین یسارعون في الكفر من الذین قالوا آمنا بأفواههم و لم تؤمن قلوبهم و من الذین هادوا سماعون لقوم آخرین لم یاتوك یحرفون الكلم عن مواضعه یقولون ان اوتیتم هذا فخذوه و ان لم یاتوه فأحذروا من یرد الله فتنة فلن تملك له من الله شیئا اولئك لم یرد الله ان یطهر قلوبهم لهم في الدنیا خزي و لهم في الآخرة عذاب الیم) ئایەتی (41) سورەتی ئەلمائیدە. هەروەها ئایەتی (44) لە هەمان سورەت کە لە پێشەوە نووسیومانە، ئایەتەکان وا دەگەیەنن کە خوا بۆ هەر نەتەوەو گەلێك بە زمانی خۆیان پێغەمبەرانی لە تەورات و ئینجیل چ حوکمێکی بۆ ناردوون پێویستە جێبەجێی بکەن و لە سەری بڕۆن و ڕەفتاری پێبکەن. هەرکەس پەیرەوی ئەو فەرمانانە نەکا ئەوا فاسیقەو بێدین و ئیمانەو کافرە. هەروەها خوا ڕووی لە پێغەمبەری ئیسلاممان موحەمەد (د.خ) دەکا دەڵێ قورئانیشمان بۆ تۆ ناردووەتە خوارێ و پەیرەوی حوکمەکانی بکەو دوای دڵخوازو ئارەزووی ئەوان مەکەوە، هەریەکە لە ئێوە ڕێگەو بەرنامەیەکم بۆ داناوە، ئەگەر خوا بیویستایە هەمووتانی دەکردە یەك میللەت و کۆمەڵ و یەك دین و یەك بەرنامە، بەڵام بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە بەو شێوەیەی

به گۆڕەی ئایینی ئیسلام پەیام و پێغەمبەر دوایی هاتووەو تەواو بووە، ئیدی گۆڕانی نیەو چۆن هاتووە هەروا دەمێنێ، هەرچەندە سەردەم و چەرخ و گۆڕانی کۆمەڵ بۆیان بلوێ یان نەلوێ و لەگەڵ بارودۆخی ئەم زەمانەدا بگونجێ یا نەگونجێ

کردووە. بەو فەرمانانەی خوا بۆی ناردووی لە نێوانیاندا حوکم بکەو دوای ئارەزوو و قسەی ئەوان مەکەوە ئاگاداربەو خۆت بپارێزە هەڵەت پێنەکەن‌و لە ڕێت لانەدەن‌و لادەی لە هەندێ فەرمانی خوا. ئەگەر پشتیان تێکردی، لات گران نەبێ‌و بزانە ئەوە خوا دەیەوێ بە هەندێ لە گوناحەکانیان ئازاریان بدات، زۆر کەس هەیە فاسیقە. ئایا ئەوانە حوکم‌وڕژێمی تاریکی‌و نەزانی‌و کۆنەپەرستیان دەوێ! کێ لە خوا باشتر حوکم دەگێڕێ. ئەمە ڕاست‌و ڕەوان حوکمی ئیسلامەو بۆ هەر کەسێك بڕوای بە ئاینی ئیسلام هەبێ‌و ئەو کەسەش کە بڕوای پێ نییەو لای وایە یاسایەکی کۆنەو ڕۆژانی بەسەرچووە با بەناوی ئیسلام‌و تەحەڕوڕو سەردەمەوە ڕژێمەکانی دیکەی جیهان بەسەر خەڵکی موسوڵماندا نەسەپێنێ‌و نەیکا بە مل ئیسلاما. جا بۆ خۆی چ دەستوورێکی پێخۆشەو لەگەڵ بیروباوەڕی دەگونجێ با هەڵیبژێرێ‌و تا ئێستا کەس ڕێگەی لێنەگرتووەو ناگرێ. جا کە ئایینی ئیسلام ئاوا بە ئاشکراو بێ پێچ‌و پەنا مافی ژن‌و پیاوی دیاریکردووە بۆچی دەبێ خەڵکی وا هەبێ خۆی بە موسوسڵمان بزانێ‌و بڵێ ئایینی ئیسلام دوو ژن هێنان‌و مارەو تەڵاقی بێپرس‌و نایەکسانی ژن‌و پیاو پوچەڵ دەکاتەوە. پوچەڵی دەکاتەوە یا دەیچەسپێنێ؟!.

ئایینی ئیسلام دوو ژنەی چەسپاندووە، بەڵکو هەر موسوڵمانێك بتوانێ مارەیی بداو نانیان بدا بۆی هەیە لە یەك ژنی ئازاد تا چوار ژنی ئازاد پێکەوە ڕابگرێ جگە لە کەنیزەك‌و جارییەو لەوانیش دەتوانێ بە سەدانیشی هەبێ بگرە بە هەزاران، ڕێگەی هەیەو هیچ کۆسپێك لەسەر ڕێگەی نییە بە مەرجێك بتوانێت نانیان بدا ژنی ئازادیش تا چوار ژن پێکەوە لە یەك کاتداو دەشتوانێ بیانگۆڕێ‌و واتا یەك دوو سێ یا هەر چواریان تەڵاق دراو هەر نەچێتە لایان‌و تەڵاقیش نەدرابێ، وەك ئایەت ڕوونی کردۆتەوە. جا بەم جۆرە گۆڕینی ژنی ئازاد تا پیاو دەتوانێ‌و توانای هەیە لە پارەوپووڵ‌و ناندان مافی هەیە بگۆڕی بە بێ سنوور دانان بۆی. ئەم (ڕا)یانەی ئیسلام کە باسمان کردووە هەمووی بە پێی ئایەت‌و حەدیس‌و ڕای ئیمامی شافیعی ئاشکرا دەکەین‌و ئەو خەڵکانەی شەرمیان لەم حوکمانە دێ‌و دەیانەوێ تەئویلی بۆ بکەن‌و شتی تر بە مل ئیسلامدا دابڕن بە ناوی مرۆڤایەتی‌و ئینسانییەت یا هەر ناوێکی تر، ئەوانە لە ئیسلام دوورن‌و بەدەریشن، ئەوانە خۆیان بڕوایان بتەو نییە، بۆیە وا تەئویلی بێ جێ دەدۆزنەوە کە قەت پێویست نییە. چونکە ئەمە حوکمی خودایەو ئایینی ئیسلامەو هەر کەسێ موسوڵمانەو بیروباوەڕی بە ئیسلام هەیە ئەمە حوکمەکەیە. بێگومان ئەوانەی بڕوایان بە ئایینی ئیسلام هەیە، بەم حوکمانە زۆر ڕازی‌و دڵخۆش‌و شانازیشی پێوە دەکەن‌و سەروماڵیشیان لە ڕێگەیدا بەخت دەکەن. ئەوەی بڕواشی پێی نییە، کەس زۆری لێنەکردووە دەتوانێ هەر بیروڕایەکی تری هەبێ، ببێ بەڵام با سەر لە موسوڵمانان نەشێوێنن.

خوێنەری بەڕێز وەك لە پێشەوە باسم کردووە سەرچاوەکانی من بۆ ئەم لێکۆڵینەوە لە ماف‌و مافخوازییەکەم، قورئانی پیرۆزە بە تەفسیری (ئەنوارولتەنزیل‌و ئەسرارولتەئویل) کە ناسراوە بە تەفسیری بەیزاوی نووسینی ناسرولدین ئەبی سەعید عەبدوڵای کوڕی عومەر کوڕی موحەمەدی شیرازی و بەیزاوی. دووەم، گوفتارو ئاکارو ڕەفتارو کردارەکانی پێغەمبەر (د.خ)و هەروەها کردەوەکانی جێگرەکانی پێغەمبەر کە لە ڕیوایەتی سەحیحی موسلیم وەرگیراوە، سەحیحی موسلیمیش یەکێکە لە شەش کتێبە باوەڕپێکراوەکانی حەدیس. سێیەم، بیروڕای ئیمامی شافیعی (خ.ل) کە لە کتێبی (ئەلئوم) وەرگیراوەو نووسینی ئیمام عەبدوڵا موحەمەد کوڕی ئیدریسی شافیعییە لە ساڵانی (150–204) ك ژیاوەو ئەم بیوڕایەی نووسیوە. جا لە مەودوا دەقەکانیان لەگەڵ وەرگێڕانیان بۆ کوردی دەخەمە بەردەستان‌و ئومێد دەکەم لێی تێبگەن‌و هەر کەمو کوڕیەکیش هەبێ لێم ببورن‌و جێگەی سوپاسە ئەگەر بیخەنەڕوو یا بۆم ڕاست بکەنەوە.

جا کە ئایینی ئیسلام ئاوا بە ئاشکراو بێ پێچ‌و پەنا مافی ژن‌و پیاوی دیاریکردووە بۆچی دەبێ خەڵکی وا هەبێ خۆی بە موسوڵمان بزانێ‌و بڵێ ئایینی ئیسلام دوو ژن هێنان‌و مارەو تەڵاقی بێ پرس‌و نایەکسانی ژن‌و پیاو پوچەڵ دەکاتەوە



# قورئانی پیرۆزو تەفسیر لە بارەی تەڵاق



سورەتی ئەلبەقەرە ئایەتی (223)دا دەڵێ (نسائكم حرث لكم فاتوا حرثكم انى شئتم) واتە ژنەكانتان كێڵگەن بۆتان، بچنە سەر كێڵگەی خۆتان چۆن حەزدەكەن، دەڵێن ئەم ئایەتە لەبەر قسەی جولەكەكان هاتۆتە خوارەوە كە دەیانگوت هەركەسێ لە پشتەوە بچێتە لای ژنی خۆی منداڵەكەی خێل دەبێ، ئەم قسەیەش گەیشتەوە پێغەمبەر (د.خ) و ئەم ئایەتە هاتەخوارێ، هەرچەندە لە تەفسیركردنی چۆن حەزدەكەن زۆر ڕاو قسە گوتراوە، بەڵام دیارە مەبەست چۆنیەتی چوونە دەنا چوونی عادەتی‌و تەبیعی مەبەستە چونكە ڕوانینی ژن وەك كێڵگە لە بەرهەمە، بەرهەمیش لە شوێن‌و زەمینەی خۆی دەبێ.

ئێمە مەبەستمان لە هێنانەوەی ئەم ئایەتە، ئەمەیە كە قورئان هەر باسی ئارەزووی پیاوی كردووە، باسی ئارەزووی ژنی نەكردووە كە چۆنە یا چییەن ئەوجار ژنیشی بە كێڵگەو موڵكی پیاوی داناوەو چۆنی دەستكاری دەكا بە ئارەزووی خۆیەتی‌و هیچ مافێك لەم ئارەزووە بۆ ژن نییە.

ئایەتی (126،227،228) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا دەڵێ (للذين يؤلون من نسائهم تربص اربعة اشهر فان فائوا فان الله غفور رحيم. و ان عزموا الطلاق فان الله سميع عليم و المطلقات يتربصن بانفسهن ثلاثة قروء و لايحل لهن ان يكتمن مات خلق الله في ارحامهن ان كن يؤمن بالله و اليوم الآخر و بعولتهن احق بردهن في ذلك ان ارادا اصلاحا و لهن مثل الذي عليهن بالمعروف و للرجال عليهن درجة و الله عزيز حكيم) واتە ئەو كەسانەی سوێند لە ژنەكانیان دەخۆن كە لەگەڵیاندا نانون، پێویستە چوار مانگ چاوەڕوانی بكەن‌و نەچنە لایان، ئەگەر پەشیمان بوونەوەو سوێندەكەیان نەگەیاندە جێ‌و لە خۆیان خست، ئەوا خوا بە بەزەیی‌و بەخشندەیە. ئەگەر هەر سووربوون لەسەر سوێندەكەیان‌و نیازی تەلاق دانیان هەبوو، ئەوا خوا بیستەرو ئاگادارە بەوەی پێویستە بكرێ. ئەو ژنانەی مێردەكانیان پاش لەگەڵ نوستنیان تەڵاقیان دەدەن، پێویستە سێ پاكی (عوزر شۆڕین–حەیز) چاوەڕوانی بكەن نابێ ئەوەی خوا لە منداڵدانیاندا دروستكردووە بیشارنەوە بۆ ئەوەی زوو بەرەڵابن‌و بتوانن مێرد بكەنەوە ئەگەر بڕوایان بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، مێردەكانیان لە پێشترن لە خەڵكی تر ئەگەر ویستیان بیانگەڕێننەوە بۆ لای خۆیان، لە كاتی چاوەڕوانییەكەیان (عیددە) مافیان بەو ئەندازەیە كە لەسەریانە بەچاكە، پیاوان پلەیەكیان پترە لەوان، چونكە مافی ژنان بریتییە لە مارەیی‌و ڕێدان بە مێردكردنەوەو درێژكردنەوەی ماوەی چاوەڕوانی (عیددە)، بەڵام مافی پیاوان لە خودی ژنان‌و لەشیانە، ئەم ئایەتە ئاشكرایە لەوەی كە تەلاقدانو هێنانەوەی ژن بەدەست پیاوە، مێرد هەركاتێ بیەوێ ژنی خۆی تەڵاق بداو هەر مێردیشە ئەگەر سوێندەكەی لە خۆی بخات‌و پەشیمان بێتەوە، ژنەكەی دەگێڕێتەوە ژێر باڵی خۆی، ژنە لێرەدا هیچ ڕایەكی نییە نە بۆ تەلاقدان‌و نە بۆ گەڕانەوەكەی، چونكە پێش تەواوبوونی چوار مانگی چاوەڕوانی پیاوی سوێندخۆر ئەگەر سوێندەكەی لە خۆی خست‌و پەشیمان بووەوە، ئەوا ژنەكەی دەگەڕێتەوە ژێر سێبەری مێرد، ژنە پێی خۆشبێ یان پێی ناخۆشبێ، هەروەها ئەگەر چوار مانگەكە تەواو بوو لەسەر تەڵاقدان ئەوا تەڵاقەكەی دەكەوێ‌و پەیوەندییەكەی نێوان ژن‌و مێرد دەبچڕێ، ژنە بیەوێ یان نەیەوێ، منداڵی وردی هەبێ یان نەبێ، بەڵام ئەگەر منداڵی وردی هەبوو لای ژنە مانەوە ئەوكاتە ژنە مافی نان پێدانی هەیە. دیسان ئایەت بە ئاشكرا دەڵێ پیاو پلەیەك پترە لە ژن‌و لە سەروی ژنەوەیە.

ئایەتی (229–230) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا (الطلاق مرتان فامساك بالمعروف او تسريح باحسان و لا يحل ان تأخذوا مما اتيتموهن شيئا فان طلقها فلا تحل له من بعد حتى تنكح زوجا غيره فان طلقها فلا جناح عليهما ان يتراجعا ان ظنا ان يقيما حدود الله تلك حدود الله يبينها لقوم يعلمون) واتا تەڵاق دووجارە مەبەست تەڵاقی ڕەجعییە یا ئەوەتە ژنە بگەڕێنێتەوە بە خۆشی‌و ڕێكوپێكی یا ئەوەتە بە یەكجارەكی دەستی لێهەڵگرێ‌و وازی لێبهێنێ بە چاكی‌و جوانی. نابێ لەوەی پێتان داون هیچیان لێوەرگرنەوە، ئەگەر مێرد بە یەكجارەكی دەستی لە ژنەكەی بەردا،

قوڕئان هەر باسی ئارەزووی پیاوی كردووە، باسی ئارەزووی ژنی نەكردووە كە چۆنە یا چییە، ئەوجار ژنیشی بە كێڵگەو موڵكی پیاوی داناوەو چۆنی دەستكاری دەكا بە ئارەزووی خۆیەتی‌و هیچ مافێك لەم ئارەزووە بۆ ژن نییە

> هەر پیاوە کە کاربەدەستە لەوەی ژن بگەڕێنێتەوە لای خۆی یان یەکجار تەڵاقی بداو دەستی لێ بکاتەوەو بەرەڵای بکا

ئەوا بۆی نییە جارێکی تر ئەو ژنە مارەبکاتەوە تا ژنە مێردێکی تر نەکاتەوە، جا ئەگەر مێردی دووەم ژنەکەی تەڵاقدا بە یەکجارەکی ئەوکاتە گوناح نییە ئەگەر مێردی یەکەم و ژنە بچنەوە لای یەکتری بە مارەیێکی تازە ئەگەر پێیان وابوو ئەمجارە دەستوورەکانی خوا دایناوە بۆ ژن و مێردایەتی دەتوانن پارێزگاری لێبکەن، ئەمەیە فەرمان و ڕێبازی خوا بۆ گەلێکی وشیارو زانا.

بە پێی ئەم ئایەتەیە کە هەندێ لە پیاوە ئایینییەکان، ئەو ماوەیە کورت دەکەنەوە بەوەی ژنی سێبەسێ تەڵاقدراو مارەدەکەن لە یەکێك کە دەسەڵاتیان بەسەریدا دەڕوا، پاش چوونی بۆ لای ژنەو لەگەڵ نووستنی، پێی تەڵاق دەدەن و سەرلەنوێ لە مێردی یەکەمی مارە دەکەنەوە، بەم کەین و بەینە لە کوردەواریدا دەڵێن (مارەبەجاش).

لێرەشدا هەر پیاوە کە کاربەدەستە، لەوەی ژن بگەڕێنێتەوە لای خۆی یان یەکجار تەڵاقی بداو دەستی لێبکاتەوەو بەرەڵای بکا مێردی دووەمیش هەروایە، مافی ژن لێرەدا هەر مارەیی و درێژنەکردنەوەی سێ مانگە چاوەڕوانییەکە لە کاتی تەڵاقدانی و نان دانییەتی ئەگەر منداڵی هەبوو و لای ژنە مانەوە، جا ئەم کارە ژنە پێی خۆشبێ یان ناخۆشبێ ئارەزووی بکا یان نەیکا دەسەڵاتی نییەو دەسەڵاتی هەر هی مێردە.

ئایەتی (231–232) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا دەڵێ (و اذا طلقتم النساء فبلغن اجلهن فامسكوهن بمعروف و لا تمسكوهن ضرارا. و اذا طلقتم النساء فبلغن اجلهن فلا تعضلوهن ان ينكحن ازواجهن) واتە ئەگەر ژنانتان تەلاقدان بە تەڵاقی ڕەجعی و ماوەی چاوەڕوانیان تەواو کرد بە خۆشی و چاکی بیانگێڕنەوە یان بە خۆشی و چاکی بەرەڵایان بکەن. مەیانگێڕنەوە بۆ ئەوەی ئازاریان بدەن و ماوەی چاوەڕوانییەکەیان درێژبکەنەوە، بە شێوەیەك کە تەڵاقی ڕەجعییان دەدەن و ماوە چاوەڕوانییەکە تەواو دەبێ دەیانگێڕنەوە دووبارە تەڵاقیان دەدەنەوەو بەم جۆرە ژنە نەدەتوانێ مێردی تر بکاو نە مێردەکەشی وەکو مێرد ڕەفتاری لەگەڵ دەکا بەم شێوەیە ئازارو زیان بە ژن دەگا، خۆ ئەگەر مێرد ئەمەش بکا هەر ئەوەیە حیسابی لەگەڵدا دەکرێ دەنا ژنە هیچ ڕێگەیەکی بە دەستەوە نییە بۆ خۆتەڵاق دان لابردنی ئەم ستەمە ی ڕێگەگرتن لە مێرد تا بەم شێوەیە ڕەفتاری لەگەڵدا نەکا. ئایەتی دووەم دەڵێ ئەگەر ژنانتان نەگێڕایەوە ژێر سێبەری خۆتان و تەڵاقتان دان و چاوەڕوانیان تەواوبوو ڕێگەیان لێ مەگرن لەوەی بگەڕێنەوە لای مێردیان جارێکی تر، یان ڕێگەیان لێمەگرن بۆ خۆیان مێرد بکەنەوە. ئەم ئایەتە لای ئیمامی شافیعی (خ.ل) بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە ژن بەبێ سەردار (وەلی ئەمر) مارە ناکرێ، هەروەکو ئایەتی (الرجال قوامون على النساء) و ئایەتی (فانكحوهن بأذن اهلهن) بەڵگەن بۆ ئەم مەبەستە.

ئایەتی (236) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا دەڵێ (لاجناح عليكم ان طلقتم النساء ما لم تمسوهن او تفرضوا لهن فريضة او متعوهن على الموسع قدره و على المقتدر قدره متاعا بالمعروف حقا على المحسنين) واتە مارەییتان ناکەوێتە سەر ئەگەر ژنانتان تەڵاقدا پێش ئەوەی بچنە لایان و لەگەڵیاندا بنون، یا مارەییەکتان بۆ دیاری نەکردبێ لە کاتێکی وەهادا بە پێی دەستڕۆیشتن دەوڵەمەند بە ئەندازەی خۆی و هەژاریش بە ئەندازەی خۆی، جل و بەرگیان بۆ بکەن و بە دڵخۆشی و چاکە یان شتێکیان بدەنێ ئەمەش پێویستە لەسەر پیاوچاك و خێرخوازان و خواپەرستان.

ئایەتی (237) لە هەمان سورەتدا دەڵێ (و ان طلقتموهن من قبل ان تمسوهن و قد فرضتم لهن فريضة فنصف ما فرضتم الا ان يعفون او يعفو الذي بيده عقدة النكاح) واتە ئەگەر ژنانتان تەڵاقدا پێش ئەوەی چووبنە لایان و مارەییەکتان بۆ دیاری کردبن ئەوا نیوەی مارەیی دیاریکراویان دەکەوێ، مەگەر ژنان نەیانەوێ و لێتان خۆشبن یا ئەوەی مارەییەکەی بە دەستە نەیەوێ بیبەخشێ، لەم ئایەتەدا دوو قسە هەیە، یەکێکیان ئەوەیە کە مەبەست لەو کەسەی گرێی مارەیی بە دەستە کە باوکە، چونکە باوك دەتوانێ کچ بە بچوکی مارەبکاو ئەگەر ئەو کچە تەلاقدراوە مارەییەکی دیاری بۆ دیاری کرابوو مافی نیوەی هەیە، بەڵام چونکە کچە منداڵەو خاوەن (ڕا) نییە باوك دەتوانێ لە نیوەی مارەیی کچی خۆی خۆش بێ و وەرینەگرێ، ئەمە قسەی کۆنی ئیمامی شافیعییە (خ.ل) قسەی دووەم ئەوەیە کە گرێ



بەدەست مێردەکە لە نیوەی خۆی خۆشبێ و هەموو مارەیی دیاریکراو بدرێ بە ژنە، پاڵپشتی ئەم قسەیە فەرموودەی ئیمامی عەلییە (س.خ) کە دەڵێ (ئەوەی گرێی نیکاحی بە دەستە مێردە). زۆر کەسی تر هەن وتویانە گرێ بەدەست مێردە، لەوانە ئیبنو سیرین و سەعیدی ئیبنو جوبەیرو ئیبنولسەییب، من خۆشم وا تێدەگەم کە مەبەست ئەو کەسەیە کە ژنەکەی لێ مارەکراوە، چونکە مارەییەکە دوو پشکی تێدایە نیو پشکی هی ژنەکەیە و نیوەکەی تری مێردی ژنەکەیە کە ئەو مێردە ئەم مارەییەی دیاریکردووە جا ژن هەر هەقی نیوەی هەیە، هەریەک لەو دووانە یان پیاو مافی ئەوەیان هەیە لە بەشەکەی خۆیان خۆشبن و وازی لێبێنن بۆ ئەویتر، بۆ ئەوەش ژنە منداڵبێ مافی لێخۆشبوونی نییە ئەوە دیارە باوک سەردارو کاربەدەستە لە شوێنێکی ترەوە ئەم مافە دراوەتە دەست باوک و وەلی ئەمر بۆیە لێرەدا ئاشکرایە مەبەست لە گرێ بەدەست مێردە و باسی ئەوەش نەکراوە کە ئایا مێرد دەتوانێ لە بەشەکەی خۆی خۆشبێ یا نە. لەم ئایەتەدا دەردەکەوێ کە هەر مێرد خاوەن دەسەڵاتە لە تەڵاقدان و ژنیش هەر مافی نیوەی مارەیی هەیە ئەگەر مێرد لەگەڵی ڕاینەبواردبێ ئەوکاتە ژن هەر مافی جلوبەرگی هەیەو هیچی تر.

ئایەتی (241) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا دەڵێ (و للمطلقات متاع بالمعروف حقا على المتقين) واتە بۆ تەڵاقدراوان جلوبەرگ پێویستە لەسەر خواپەرستان ئەو ژنانەی تەڵاقدراون هێشتا ماوەی چاوەڕوانیان تەواو نەبووە پێویستە جلوبەرگیان بۆ بکرێ.

ئایەتی (49) لە سورەتی ئەلئەحزابدا دەڵێ (یا ایها الذین آمنوا اذا نکحتم المؤمنات ثم طلقتموهن من قبل ان تموسوهن فمالکم علیهن من عدة فمتعوهن و سرحوهن سرحا جمیلا) واتە ئەی ئەوانەی بڕواتان هەیە ئەگەر ژنانی بڕوادارتان مارە کردو لە پاشان تەلاقتان دان پێش ئەوەی دەستیان لێبدەن ئێوە مافی ئەوەتان نییە کە ماوەی چاوەڕوانیان بۆ دابنێن، جلوبەرگیان بۆ بکەن و بەڕێیان بکەن بە جوانی. لەم ئایەتەدا بۆ مارەکردن و تەڵاقدان خوا ڕوو لە پیاو دەکاو هیچ قسەیەک بۆ ژن ناهێڵێتەوە، تەنها مافی ژن لێرەدا ئەوەیە کە جلوبەرگی بۆ بکرێ و ڕێی لێنەگیرێ مێردێکی دیکە بکا، دەنا ئەو مێردەی خۆشویستووەو ئارەزووی لێبەتی لێی نییە هیچ هەقی نییە ناتوانێ تەڵاقەکەی ڕاگرێ.

ئایەتی (1-2) لە سورەتی ئەلموجادەلەدا دەڵێ (قد سمع الله قول التي تجادلك في زوجها و تشتكى الى الله و الله یسمع تحاورکما ان الله سمیع بصیر. الذین یظاهرون منکم من نسائهم ماهن امهاتهم الا الاتی ولدنهم انهم لیقولون منکرا من القول و زورا و ان الله لعفو غفور. و الذین یظاهرون من نسائهم ثم یعودون لما قالوا فتحریر رقبة من قبل ان یتماسا ذلك توعظون به و الله بما تعملون خبیر) لە پێشەوە ئەم ئایەتەمان تەفسیرو لێکداوەتەوە پێویست ناکا وەری بگێڕینە سەر زمانی کوردی، بەڵام ئەمەش دیسان بەڵگەیەکی ترە کە تەنها مێرد سەرداری تەڵاقدان و مارەکردن و گەڕاندنەوەی ژنەو ژن هیچ دەسەڵاتێکی نییە.

ئایەتی (1-2) لە سورەتی ئەلتەلاق (یا ایها النبي اذا طلقتم النساء فطلقوهن لعدتهن و احصوا العدة و اتقوا الله ربكم. لا تخرجوهن من بیوتهن و لا یخرجن الا ان یأتین بفاحشة مبینة و تلك حدود الله و من یتعد حدود الله فقد ظلم نفسه. لا تدري لعل الله یحدث بعد ذلك امرا فأذا بلغن اجلهن فأمسکوهن بمعروف و اشهدوا ذوي عدل منکم و اقیموا الشهادة لله ذلکم یوعظ به من کان یؤمن بالله و الیوم الآخر و من یتق الله یجعل له مخرجا) واتە ئەی پێغەمبەر ئەگەر ژنانتان بەرەڵا کردن لە ماوەی چاوەڕوانیدا تەڵاقیان بدەن و با ماوەی چاوەڕوانیەکە تەواو بکەن و لە خوا بترسن لە ماڵی خۆیان وەدەریان مەنێن ئەوانیش با دەرنەچن لە ماوەی چاوەڕوانی، مەگەر کارێکی ناشیرینیان لێ ڕوویدا ئەمەش سنووری خوایە، هەر کەسێك سنووری خوا ببەزێنێ دیارە خۆی تاوانبارە. تۆ چوزانی؟ بەڵکو خوا پاش ئەمە شتێکی تر دێنێتە کایەوە. ئەگەر ماوەی چاوەڕوانیان تەواوکرد بیانگێڕینەوە بە خۆشی یان لێێن جیا ببنەوە بە خۆشی، بۆ ئەم مەبەستەش پیاوی ڕاست بکەن بە شایەت و با ئەوانیش شایەتی بۆ خوا بدەن.

ئایەتی (19) لە سورەتی ئەلنیساودا دەڵێ (و ان ارتم استبدال زوج مکان زوج و اتیتم احداهن قنگارا فلا تأخژوا منه شیئا اتأخژونه بهتانا و ایما مبینا) واتە ئەگەر ویستتان ژنێك بگۆڕن بە ژنێکی تر ئەگەر بە باریش زێڕتان دابێتە ژنە تەڵاقدراوەکە، نابێ هیچی لێوەربگرنەوە، ئایا بە درۆو گوناحێکی ئاشکرا لێیان وەردەگرنەوە. ئەمە هەندێ لەو ئایەتانەی کە باسی تەڵاقدان دەکەن و هەر ڕوو لە پیاو دەکاو ژن هیچ هەقێکی نییە قسە بکا یا ڕەخنە بگرێ تەنها مارەیی و جلوبەرگ و نانپێدانی هەیە وەك لە پێشەوە ڕوونکراوەتەوە. ئێستاش ئەو گوفتارو ڕەفتارانەی پێغەمبەر (د.خ) دەگێڕینەوە.

**ئەمە هەندێ لەو ئایەتانەن کە باسی تەڵاقدان دەکەن و هەر ڕوو لە پیاو دەکاو ژن هیچ هەقێکی نییە قسەبکا یا ڕەخنە بگرێ تەنها هەقی مارەیی و جلوبەرگ و نانپێدانی هەیە**

# حەدیسەکانی دەربارەی تەڵاق

جزمی دەیەم لاپەڕە (60) لە سەحیحی موسلیم دەڵێ (حدثنا يحيى بن يحيى التميمي قال قرات على مالك ابن انس عن نافع عن ابن عمر انه طلق امراته و هي حائض في عهد رسول الله (ص) فسأل عمر بن الخطاب رسول الله (ص) عن ذلك فقال رسول الله (ص) مره فليرجعها ثم ليتركها حتى تطهر ثم تحيض ثم تطهر ثم ان شاء امسك و ان شاء طلق قبل ان يمس فتلك العدة التي امر الله عزوجل ان يطلق لها النساء) دەڵێ کوڕەکەی عومەر ژنەکەی خۆی تەڵاقدا لە کاتێکدا ژنەکەی لە عادەی شەهریدا بوو (حەیز)، ئەم ڕووداوە لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ) ڕوویداوە. عومەری کوڕی خەتتاب لەم بارەیەوە لە پێغەمبەری پرسی پێغەمبەر (د.خ) وتی فەرمانی پێبکە با بیگێڕێتەوە لە پاشا لێی بگەرێ تا پاك دەبێتەوەو جارێکی تر دەکەوێتەوە عادەی شەهری (حەیز) و جا پاك دەبێتەوە ئەنجا ئەگەر حەزبکا دەیگێڕێتەوە ژێر سێبەری خۆیو گەر حەزیش بکا تەڵاقی دەدا پێش ئەوەی دەستی بگەیەنێتێ، ئا ئەمەیە ئەو چاوەڕوانییەی کە خوا فەرمانی پێکردووە کە ژنی تێدا تەڵاق بدرێ. ئایەتەکەش ئەمەیە کە دەڵێ (ان طلقتم النساء فطلقوهن لعدتهن) لەم حەدیسەش دیارە کە بەبێ ئاگاداریو پرسی ژن، ژن تەڵاق دەدرێ پیاو بە ئارەزووی دڵی خۆی هەرکاتێ بیەوێ تەڵاقی دەداو حەزیش بکا دەیگێڕێتەوە ژێر سێبەری خۆی.

حەدیسێکی تر دەڵێ (حدثنا ابوبكر بن ابي سيبه و عمرو والناقد و اللفظ لعمرو قالا حدثنا سفيان عن الزهري عن عروة عن عائيشة قالت جاءت امرأة رفاعة النبي (ص) فقالت كنت عند الرفاعة فطلقني فبت طلاقي فتزوجت عبدالرحمن بن الزبير و ان ما معه مثل هدية الثوب فتبسم رسول الله (ص) فقال اتريدين ان ترجعي الى رفاعة؟ لا حتى تذوقي عسيلته و يذوق عسيلتك قالت و ابوبكر عنده و خالد بالباب ينتظران يؤذن له فنادى يا ابابكر الاتسمع هذه ماتجهر به عند رسول الله) واتە دەڵێ کۆنە ژنی ڕیفاعە هاتە لای پغەمبەر (د.خ) گوتی لای ڕیفاعە بووم و تەڵاقی سێبەسێی داوم و مێردم بە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەلزوبەیر کرد ئەویش ئەوەی هەیەتی وەك ڕیشۆڵەی ئەم کراسەمە (نەرم و شلە) پێغەمبەریش گرژییەوەو بزەی هاتیو گوتی دەتەوێ بگەڕێیتەوە لای ڕیفاعە، نا نابێ تا شیرینی ئەو نەچێژیو ئەویش شیرینی تۆ نەچێژێ لەمەشدا دەردەکەوێ کە ژن لە تەلاقدان و گەڕانەوە هیچی بەدەست نییەو هەموو کار هەر بەدەست پیاوە. ڕیوایەتی تر لەم بابەتە زۆرە بەڵام چونکە هەمووی لە مەعنادا نزیکی یەکن بۆیە نایانووسینەوە، هەرکەس حەزدەکا بە بفەرموێ تەماشای کتێبی سەحیحی موسلیم بەرگی دەیەم یا چوارەم لە چاپی مەکتەبەو مەتبەعەی موحەمەد عەلی سەبیح و ئەلادوهو قاهیرە) بکا.

ئەوجار مەزهەبی شافیعی وەك لە کتێبی (ئەلئوم) نووسینی ئیمام ئەبی عەبدیلا موحەمەد و بنو ئیدریسی ئەلشافیعی (150—204) بەرگی پێنجەم چاپی (شركة الطباعة الفنية المتحدة، القاهرة) لاپەڕە (179) لە باسی تەلاقدا دەڵێ:

## أباحة الطلاق

(اخبرنا الربيع بن سليمان قال (قال الشافيعي) قال الله عزوجل (اذا طلقتم النساء فطلقوهن لعدتهن) الآية و قال (لا جناح عليكم ان طلقتم النساء مالم تمسوهن) و قال (اذا نكحتم المؤمنات ثم طلقتموهن) الآية و قال (ان اردتم استبدال زوج مكان زوجا) و قال (الطلاق مرتان فامساك بمعروف او تسريح باحسان) مع ما ذكرته من الطلاق في غير ماذكرت و دلت عليه سنة رسول الله (ص) من اباحة الطلاق، فالطلاق مباح لكل زوج لزمه الفرض) ئیمام دەڵی بە پێی ئەو ئایەتانەو قسەی پێغەمبەر لە بارەی تەڵاقدانی ژن تەڵاق حەڵاڵە بۆ هەر مێردێك کە ئەرکەکانی ئیسلامی لەسەر واجیب بێ، واتە پیاوە ئاقڵ بێو خۆی ناسبێ.





**لە مێرد قەدەغە نییە ئەگەر دوو تەڵاق یان سێ بە سێ ژنی خۆی تەڵاق بدا، چونكە خوا تەڵاقدانی بۆ مێرد حەڵاڵكردووەو ئەوەی ڕێدراوە نابێتە قەدەغە لە خاوەنی خۆی**

(قال الشافعي رحمه الله: أختار للزوج ان لا يطلق الا واحدة ليكون له الرجعة في المدخول بها و يكون خاطبا في غير المدخول بها و متى نكحها بقيت له عليها اثنان من الطلاق و لا يحرم عليه ان يطلق اثنين و لا ثلاثا لأن الله تبارك و تعالى أباح الطلاق و ما اباح ليس بمحضور على اهله و ان النبي (ص) علم عبدالله بن عمر موضع الطلاق ولو كان في عدد الطلاق مباح و محضور علمه ان شاء الله تعالى اياه لأن من خفي عليه ان يطلق امرأته طاهرا كان مايكره عن عدد الطلاق و حيب لوكان مكروه اشبه ان يخفي عليه. و طلق عويمر العجلاني امراته بين يدي النبي (ص) ليعلمه و جماعة من حضر، وحكت فاطمة بنت قيس ان زوجها طلقها البتة يعني و الله اعلم ثلاثا فلم يبلغنا ان النبي (ص) نهى عن ذلك، و طلق ركانة امرأته البتة و هي تحتمل واحدة و تحتمل ثلاثا فساله النبي (ص) عن نيته و احلفه عليها و لم نعلمه نهى ان يطلق البتة يريد بها ثلاثا و طلق عبدالرحمن بن عوف امرأته ثلاثا) ئیمام دەلی سەرپشكی دراوەتە مێرد بە یەك تەڵاق بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە لەو ژنەی چووەتە لای، ئەو ژنەی هێشتا نەیگوازتووەتەوە دەگەڕێتەوە بە خواستی ژنە جارێكی ترو كە گواستییەوە هێشتا دوو تەڵاقی دەمێنێ، لە مێرد قەدەغە نییە ئەگەر دوو تەڵاق یان سێ بە سێ ژنی خۆی تەڵاق بدا، چونكە خوا تەڵاقدانی بۆ مێرد حەڵاڵ كردووەو ئەوەی ڕێدراوە نابێتە قەدەغە لە خاوەنی خۆیو پێغەمبەر (د.خ) كە عەبدوڵای كوڕی عومەری فێری شوێنی تەڵاقدان كرد ئەگەر خراپییەك لە ژمارەی تەڵاقدان هەبوایە ئەویشی فێردەكرد چونكە كەسێك نەزانێ ژنی لە كاتی پاكی تەڵاق بدا ئەگەر ژمارەش خراپبایە دەبوو ئەویشی نەزانیو پێغەمبەر (د.خ) پێی بگوتبایە جگە لەمەش عوەیمیری كوڕی عەجلانی ژنەكەی لە پێش پێغەمبەر (د.خ) سێ بە سێ تەڵاق دا پێش ئەوەی پێغەمبەر فەرمانی پێبكاو ئاگاداری بكا كە ژنەكەی بە (لیعان) تەلاق دەدرێ جا ئەگەر خراپییەك لە ژمارەدا هەبوایە پێغەمبەر (د.خ) پێی دەگوت وا مەكە بۆ ئەوەی خۆیو ئەو خەڵكەی ئەویش بزانن. فاتیمەی كچی قەیس دەگێڕێتەوە كە مێردەكەی تەڵاقی یەكجاری داوە واتە سێ بەسێ (خوادەزانێ) پێمان نەگەیشتووە كە پێغەمبەر (د.خ) گوتبێتی وا مەكەن، هەروەها ڕەكانە ناوێك ژنەكەی خۆی بە یەكجاری تەڵاقدا كە دووڵای هەڵدەگرت یەكەم یەك تەڵاقەو سێ تەڵاقە پێغەمبەر (د.خ) لە نیازی پرسی كە نیازی چەند تەڵاق بووە وە لە سەریشی سوێندیدا، ئەویش دیارە نیازی سێ تەڵاقە بووەو نەمانزانیوە پێغەمبەر (د.خ) گوتبێتی وا مەكەن عەبدولڕەحمانی كوڕی عەوف ژنەكەی خۆی سێ بەسێ تەڵاق داوە. جا نەك هەر ئەوەندە پیاو دەتوانێ ڕووبەڕووی ژنەكەی تەڵاقی بدا بەڵكو لە دوورەوەش بە نامە دەتوانێ ژنەكەی خۆی تەڵاق بدا كە ژنی بەدبەخت ئاگای لە هیچ نییە، وەك لە لاپەڕەی (181)ی هەمان سەرچاوەدا دەڵێ (قال الشافيعي رحمه الله اذا كان رجل غائب عن امرأته فاراد ان يطلقها للسنة كتب اليها "اذا اتاك كتابي هذا وقد حضت بعد خروجي من عندك فأن كنت طاهرا فانت طالق" و ان كان يعلم انها حاضت و طهرت و هو غائب كتب اليها "اذا اتاك كتابي فأن كنت طاهرا فأنت طالق و ان كنت حائضا فاذا طهرت فأنت طالق"..).

واتە ئەگەر مێرد لە ژنەكەی بزر بوو ویستی ژنەكەی تەڵاق بدا بە پێی فەرمانی پێغەمبەر (د.خ) كە تەلاقی سوننەی پێدەڵێن ئەویش ئەوەیە ژن لە كاتی پاكی تەلاق بدرێ. بۆیە بۆ ژنەكەی دەنووسێ (ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێگەیشت و كە من لە لای تۆ دەرچووم ئەتۆ بێنوێژ بووی، ئەگەر پاكی تەڵاقت كەوتبێ) تەڵاقەكە دەكەوێ. ئەگەر مێرد زانی ژنەكەی پێش دەرچوونی كەوتووەتە بێنوێژیو نەچووبووە لای یان زانی كە بێنوێژ بووەو پاك بووەتەوەو خۆی دوورە لێی بۆی دەنووسێ (ئەگەر نامەی منت پێگەیشت ئەگەر پاكی تەلاقت كەوتبێ ئەگەر بێنوێژیشی هەركاتێ پاك بوویتەوە تەلاقت كەوتبێ) تەلاقەكە دەكەوێ.

(و اذا قال الرجل لأمرأته التي تحيض انت طالق ثلاثا سنة وقعن جميعا معا في وقت طلاق السنة) واتە ئەگەر مێرد بە ژنەكەی خۆی كە لەوانەیە بێنوێژی دەبینێ (منداڵ نا) گوت هەرسێ تەلاقەت كەوتبێ بە تەلاقی سوننەت هەرسێك پێكەوە دەكەون لە كاتی پاكی ژنە. لاپەڕە (254) لە هەمان كتێب (قال الشافعي رحمه

الله (ملك الله تعالى الأزواج الطلاق فمن طلق من الأزواج و هو بالغ غير مغلوب على عقله جاز الطلاق لأنه تحريم لأمرأته بعد ان كانت حلالا له فسواء كان صحيحا حين يطلق او مريضا فالطلاق واقع) ئیمام دەڵی خوا تەڵاقی داوەتە مێردان هەر مێردێك كە خۆی ناسیبێ‌و هۆشی لەدەست نەدابێ، تەلاقی دروستە، چونكە تەلاق قەدەغەكردنی ژنیەتی لە خۆی پاش ئەوەی لێی حەڵاڵ بووە، جا مێرد لەشی ساغ بێ لە كاتی تەڵاقداندا تەڵاقەكەی دەكەوێ.

(قال الشافعي رحمه الله: و من شرب خمرا او نبيذا فاسكره لزمه الطلاق و الحدود كلها و الفرائض و لا تسقط المعصية بشرب الخمر و المعصية بالسكر من النبيذ عنه فرضا و لا طلاقا) دەڵی ئەگەر كەسێك عارەقی خواردەوە یان ئاوجۆ (بیرە) و سەرخۆش بوو ژنەكەی خۆی تەڵاقدا تەلاقەكەی دەكەوێ‌و سزای شەرعیشی لەسەر دەبێ‌و هەروەهاش فەرزەكان گوناح كردن بە خواردنەوەی عارەق و سەرخۆشبوون بە خواردنەوەو ئاوجۆ فەرزو تەلاق لەسەر لانابا و لە دەست نادا. ئەمە قسەی ئیمامی شافیعییە (خ.ل)

جا ئەوە لە كوی هات ئەو كەسەی دەڵی ژن مافی تەلاقی لەگەڵ مێرد یەكسانە یان دەڵێ ئەوان كۆڵكە مەلان كە تەڵاقیان لەبەردەست پیاو داناوەو ژنیان بێبەش كردووە، دەبێ ئەو كەسەی ئەم قسانەی لە كوی هێنابێ، ژنەی دانیشتووی ماڵ دڵخۆش بە ماڵو منداڵی یا ژنێكی خوێندەواری خەریكی دەرس گوتنەوەو خزمەتی وڵات و میللەتەكەی بێ لە قوتابخانەو یان لە نەخۆشنانەو شوێنی تر، مێردێكی سەرخۆش لە خۆیەوە هەر بە هەوەس و ئارەزوو یا دەمەقاڵێ یەكی ڕۆژێك لە ڕۆژانی بەسەرچوو بە سەرخۆشی بكەوێتە بیری‌و ژنەكەی سێ‌بەسێ تەڵاق بداو تەلاقەكەش دەكەوێ‌و تا ژنە مێردێكی دیكە نەكاتەوە تازە نابێ لەگەڵ ئەو مێردە بمێنێ یا منداڵیش هەبن. ئەمەیە حوكمی فیقهی ئیسلامی‌و لەسەر زاری پێغەمبەر (د.خ)و ڕای ئیمامی شافیعی. ئیدی ئەو كەسانەی بەمەی ڕازی نین دیارە موسوڵمان نین و بڕواشیان بە ئیسلامەتی نییە، بۆیە نابێ بە ناوی ئیسلام قسەیان بڕواو دەبێ پشت گوێ بخرێن.

ئەمەیە حوكمی فیقهی ئیسلامی‌و لەسەر زاری پێغەمبەر (د.خ)و ڕای ئیمامی شافیعی. ئیدی ئەو كەسانەی بەمەی ڕازی نین دیارە موسوڵمان نین و بڕواشیان بە ئیسلامەتی نییە، بۆیە نابێ بە ناوی ئیسلام قسەیان بڕواو دەبێ پشتگوێ بخرێن



# مارەکردن و چەندژنی

هەرچەندە ئەو نووسەرو چیرۆكنووسانەی باسمان كردن لە خەیاڵی خۆیاندا مارەو تەلاق و تەنها یەك ژنییان دەستنیشان كردبوو بە ناوی ئیسلامەوەو ژن و پیاویان وەك یەك هاوتا لە قەڵەم دابوو، بەڵام بە داخەوە خەیاڵەكەیان درێژەی نەكێشاو لەسەر ڕێبازی ئیسلام وەك كەفی سەرئاو بڵاو و ون بوون فەرموون ئەوەی لە دواوە دێ حوكمی ئیسلامە لە مارەكردن و تا چەند ژنیش دروستە بۆ پیاو لە یەك كاتدا.

ئایەتی (3-4) لە سورەتی ئەلنیسا دا دەڵێ (و ان خفتم الا تقسطوا في اليتامى فانكحوا ماطاب لكم من النساء مثنى و ثلاث و رباع. فأن خفتم الا تعدلوا فواحدة او ما ملكت ايمانكم ذلك ادنى الا تعدلوا و آتوا النساء صدقاتهن نحلة فان طبن لكم عن شيء منه فكلوه هنيئا مريئا) واتە ئەگەر ترسان لەوەی كە نەتوانن جێبەجێی پێویست بكەن بەرامبەر بەو كچە بێ باوكانەی لاتانن، یاخود ترسان لەوەی كاری خراپیان لەگەڵدا بكەن، ئەوا لەو ژنانەی دڵخوازتانن دوو دوو و سێ سێ و چوار چوار بێنن، ئەگەر ترسان لەوەی، یەكسانی لە نێوانیاندا نەكەن ئەوا تەنها ژنێك بەسە. یا بە كەنیزەك خۆتان دابین كەن و ئیكتیفا بكەن ئەمەیان باشترە بۆ ئەوەی خێزانتان زۆر نەبێ، مارەیی ژنان بە تەواوی بدەن ئەگەر بە خۆیان شتێكیان لێخۆش بوون ئەوا بیخۆن‌و لە گیانتان خۆشبێ. مەبەست لە دوو دوو سێ سێ‌و چوار چوار ئەوە نییە كە پێكەوە دووان یان سیان، یان چوار پێكەوە بهێنن بەڵكو مەبەست ئەوەیە كە دەتوانن لە دوو ژن تا چوار ژن پێكەوە لە یەك كاتدا لەژێر سێبەرتان بن، بە مەرجێك كە جۆرە عەدالەتێك و یەكسانییەك لە بەشی



مێردایەتی بەلای کەم بە کردەوە لە نێوانیاندا بکەن، ئەگەر مێرد زانی ئەوەی پێناکرێ ئەوا تەنها یەك ژنی ئازاد بەسە لەگەڵ چەند دەتوانی کەنیزەکی هەبێ. بەڵام ئایا یەکسانیو عەدالەت لە نێوان ژنەکاندا چۆنەو چۆن ڕاگیر دەکرێ ئەو لە ئایەتی (129) لە سورەتی ئەلنیسادا دیاری کردوەو دەڵێ (و لن تستطیعوا ان تعدلوا بین النساء و لو حرصتم فلا تمیلوا کل المیل فتذورها کالمعلقة) واتە ناشتوانن یەکسانی لە نێوان ژنان بپارێزن هەرچەند هەوڵیش بدەن و سووربن لە سەری، بەڵام وا مەکەن وازی لێ بهێنن بە جۆرێك وەك هەڵپەساردراوبێ، کە نە ئەوەیە ژن و مێردایەتی لەگەڵدا دەکرێو نە ئەوەیە کە بتوانێ مێردێکی تر بکا لەو ناوەدا دەسوڕێتەوە. وەك کوردەواری دەڵێن لەنێو چاڵان و ماڵانیان هێشتۆتەوە. ئەمە تەفسیری ئایەتی (فأن خفتم الا تعدلوا) ئەگەر مێردێك ویستی ژنی تر بهێنێ، ئەگەر لە خۆی ڕانەدەبینی کە دەتوانێ ئەم یەکسانییە لە نێوانیاندا بپارێزی با بە یەك ژن بەس بکاو هی تر نەهێنێ، بەڵام ئەگەر لە خۆی ڕابینی کە دەتوانێ ژنەکەی پێشوی وەك (نە ئازادو نە مێردار) لێنەکا ئەوا دەتوانێ ژنی تر بهێنێو بۆی حەڵاڵە جا کێ هەیە نەتوانێ ئەمە بکا؟! هەروەکو کردارو ڕەفتاری پێغەمبەر (د.خ) مەعنای ئەم ئایەتە ڕوونەکاتەوە هەروەها هاوەڵەکانی پێغەمبەر (د.خ) چونکە ئەگەر ئەوانە بیانزانیایە ئەوەندەی تۆزقاڵێك لە ڕووی ئاییینەوە گوناحی تێدایە، لە ژنێك زیاتریان نەدەهێنا هەروەکو ئەگەر پێناخۆش بوونی وای تیابوایە پێغەمبەر نۆ ژنی نەدەهێنا کە هەموو ڕوایەتەکان یەکیان گرتووە کە پێغەمبەر (د.خ) لە یەك کاتدا نۆ ژنی هەبووەو هەندێکیش دەڵێن دوانزە ژنی هەبووە لە یەك کاتدا، بێ لە کەنیزەك و جگە لەو ژنانەی کە هەر بۆ پیرۆزیو تەبەڕك خۆیان پێشکەش پێغەمبەر (د.خ) کردووە، ئەمەش ئەو حەدیسەیە کە دەڵێ پێغەمبەر (د.خ) نۆ ژنی هەبووە پێکەوە لە یەك کاتدا.

ئەگەر مێردێك ویستی ژنی تر بهێنێو لە خۆی ڕانەدەبینی کە دەتوانێ ئەم یەکسانییە لە نێوانیاندا بپارێزێ با بە یەك ژن بەس بکاو هی تر نەهێنێ، بەڵام ئەگەر لە خۆی ڕابینی کە دەتوانێ ژنەکەی پێشوو وەك (نە ئازادو نە مێردار) لێ نەکا ئەوا دەتوانێ ژنی تر بهێنێو بۆی حەڵاڵە

سەحیحی موسلیم جزمی چوارەم دەڵێ (حدثنا ابوبکر بن ابي شیبة حدثنا شبابة بن سوار حدثنا سلیمان بن المغیرة عن ثابت عن انس قال کان للنبي (ص) تسع نسوة فکان اذا اقسم بینهن لا ینتهي الی المرأة الأولی الا في تسع فکن یجتمعن کل لیلة في بیت التي یأتیها فکان في بیت عائیشة فجاءت زینب فمد یده الیها فقالت هذه زینب فکف النبي (ص) یده فتقاولتا حتی استخبا و اقیمت الصلاة فمر ابوبکر علی ذلك فسمع اصواتهما فقال اخرج یا رسول الله الی الصلاة واحث في افواهن التراب فخرج النبي (ص) فقالت عائشة الآن یقضي النبي (ص) صلاته فیجيء ابوبکر فیفعل بي و یفعل فلما قضی النبي (ص) صلاته اتاها ابوبکر فقال لها قولا شدیدا و قال اتصنعین هذا) واتە پێغەمبەر نۆ ژنی هەبووە لە یەك کاتدا جا کە بەشی دەکرد نەدەگەشتەوە لای ژنی یەکەم لە نۆیان نەبوایە، واتە بەسەر هەموویاندا دەسووڕاو نۆیەم جار دەگەیشتەوە ژنی یەکەمی، ژنانی پێغەمبەر (د.خ) هەموو شەو لە ماڵی ئەو ژنەی کە نۆبەی بووە کۆبوونەتەوە ئێوارەیەك لە ماڵی عائیشە بوو کەزەینەبەی ژنی پێغەمبەر هات و پێغەمبەریش دەستی بۆ درێژکردو عائیشە گوتی ئەمە زەینەبەیەو پێغەمبەریش (د.خ) دەستی خۆی کێشایەوەو ئیدی عائیشەو زەینەبە لێك وەدەنگ هاتن هەتا دەنگیان بەرز بۆوەو هاواریان لێهەستا، لەو کاتەدا بانگی نوێژدراو ئەبوبەکر (خ.ل) باوکی عائیشە بەوێدا تێپەڕیو گوێی لە دەنگیان بوو گوتی ئەی پێغەمبەری خوا دەرچۆ بۆ نوێژو خۆڵیان لە دەم بکە، پێغەمبەریش (د.خ) دەرچوو عائیشە گوتی ئێستا پێغمبەر لە نوێژ دەبێتەوەو ئەبوبەکر دێ ئەو هاوئەوهام پێدەکات، کە نوێژ تەواو بوو ئەبوبەکر هەر قسەی توندی بە عائیشەی کچی گوت، گوتی ئاوا دەکەی؟ وەك (نەوەوی) باسی دەکا ژنەکانی پێغەمبەر (د.خ) لەوکاتەدا ئەمانە بوون (عائیشە، حەفسە، سەودە، زەینەبە، ئوممی سەلمە، ئوممی حەبیبە مەیمونە، جووەیریە، سەفییە) خوا لێیان خۆشبێو دوو کەنیزەکیشی هەبووە کە ناویان (مارییەو ڕەیحانە) بووە. لەم حەدیسە وەك من بۆی دەچم چوار شت بەدی دەکرێ.

یەکەم: کە پێغەمبەر (د.خ) نۆ نژی هەبووە پێکەوە لە یەك کاتدا.

دووەم: ڕاگرتنی یەکسانی لە نێوانیاندا ئەوەبووە هەر شەوەی لای یەکێکیان نووستووەو حەزیشی کردووە لەگەڵ یەکێکی تر بنوێ وەك کە نۆبەتی عائیشە بووە دەستی بۆ زەینەبە درێژکردووە.

سێیەم: ئەوەیە کە ئەبوبەکر بە سوکی تەماشای ژنانی کردووەو بە پێغەمبەری گوتووە خۆڵیان لە دەم بکە. پێغەمبەریش هیچ پێ ناخۆشییەکی پیشان نەداوە هەرچەندە عائشە کچی خۆی بووە ئەگەر قسەیشی پێی‌بڵێ لایەنی باوکایەتی‌و کچایەتی ڕێی تێدەچێ بەڵام ئێستا کە ژنی پێغەمبەرەو زەینەبە کە پورزای پیغەمبەر بووەو ژنیشی بووە، کە پێیان بگوترێ خۆڵیان لە دەم بکە قسەیەکی سوکەو بۆ مرۆڤ بەکارنایە، لە بنەڕەتدا ئەم وشەیە بۆ گسوك بەکاردەبرێ لێرەدا دەردەکەوێ کە بایەخ بە ژن نەدراوەو بە هەندیان هەڵنەگرتووە.

چوارەم: ئەوەیە کە ژنانی پێغەمبەر حەزیان نەکردووە پێغەمبەر (د.خ) ئەو هەموو ژنەی هەبێ یان ژنی تر بێنێ، چونکە ئەگەر وانییە نەدەبوو عائیشە لەگەڵ زەینەبەدا بە دەنگ بێ لەسەر ئەوەی نۆبەتی خۆی بووەو پێغەمبەر (د.خ) دەستی بۆ زەینەبە درێژکردووە، ئەگەر ژن ڕایەکیان هەبوایە قبوڵیان نەدەکرد پیاو ئەوەندە ژن بێنێ یان لە یەك زیاتر وەك لە حەدیسی سەحیحی موسلیمدا هاتووەو دەڵێ (حدثنا ابو كريب محمد بن العلاء حدثنا ابو اسامة عن هيشام عن ابيه عن عائشة قالت كنت أغار على اللاتي وهبن انفسهن لرسول الله (ص) و اقول و تهب المرأة نفسها؟ فلما انزل الله عز و جل ترجي من تشاء منهن و توؤي اليه من تشاء و من ابتغيت ممن عزلت. قالت قلت و الله ما أرى ربك الا و يسارع في هواك) واتە عائیشە گوتی من دڵگران دەبووم لەو ژنانەی کە خۆیان پێشکەشی پێغەمبەر دەکردو دەمگوت ژن چۆن خۆی پێشکەش دەکا؟ کاتی خوا ئایەتی نارد بۆ ئەوەی حەزبکەی دوای دەخەی‌و ئەوەی ئارەزووشی بکەی دەیهێنیتە لای خۆت و ئەوەی ئارەزووت کرد لەوانەی دوورت خستونەتەوە دەیانهێنیتەوە. دەڵێ گوتم بە خودا وا بزانم خوایەکەت پەلەیەتی لە جێبەجێکردنی ئارەزووەکانت.

حەدیسێکی تر کە تەنها (تورموزی) بەشداری گێڕانەوەی نەکردوە پێنجەکەی تر گێڕاویانەتەوە کە لە کتێبی (التاج الجمع اصول في احادث الرسول) تأليف الشيخ منصور علي ناصف من علماء الأزهر الشريف، و عليه غاية المأمول شرح التاج الجامع للاصول. چاپی سێیەم (1961ز) لاپەڕە (380) دەڵێ (عن انس (رض) قال: كان النبي (ص) يطوف على نسائه في الليلة الواحدة و لە (ص) يومئذ تسع نسوة رواه الخمسة الا الترمذي) لە شەرحەکەیدا دەڵێ (فكان يطوف عليهن احيانا في ليلة واحدة و يواقعهن و كان الله اعطاه قوة على ذلك معجزة لە (ص) كما كان سليمان عليه السلام) واتە لە ئەنەسی دەگێڕنەوە دەڵی پێغەمبەر (د.خ) لە شەوێکدا بەسەر هەموو ژنەکانیدا دەگەڕا ئەوکاتەش نۆ ژنی هەبووە. وە شەرحەکە دەڵێ وا بووە لە شەوێکدا بەسەر هەموویاندا گەڕاوەو لەگەڵ هەمووشیان نووستوەو خوا ئەو هێزەی داوەتێ وەك موعجیزەی هەروەکو سولەیمان پێغەمبەر (د.خ) ئەو هێزەی هەبووە، چونکە سەد ژنی هەبووە.

لە حەدیسێکی تردا دەڵێ (عن ابن عباس (ر.ض) قال توفى النبي )ص) و عنده تسع نسوة و قالت عائشة (ر.ض) ما توفى النبي )ص) حتى احل الله له ام يتزوج من النساء ماشاء رواهما النسائي) واتە لە کوڕی عەباس دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (د.خ( کاتێك مردووە نۆ ژنی هەبووە، لە عائیشە (خ.ل) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (د.خ) نەمردووە تاوەکو خوا بۆی حەڵاڵ کردووە هەرچەندە حەزدەکا ژن بێنێ. ئەم دوو گوفتارە نەسائی ڕوایەتی کردوون.

لە غایەتولمەئمول شەرحی تاج دەڵێ: یەکەم جار ژن هێنان بۆ پێغەمبەر (د.خ) بێ سنوور بووەو چەندی حەزبکردایە بۆی حەڵاڵ بووە بێنێ، بەڵام لە پاشدا بۆی دیاریکراو سنوری بۆ دانرا تەنها کەنیزەك بێ سنوور دانان مایەوە. واتە لە کەنیزەك چەندی هەبێ‌و ئارەزووی بکا بۆی ئازادو حەڵاڵە. لە هەمان کتێب لاپەڕە (281)دا دەڵێ: ڕاز لە زۆر ژن هێنانی پیغەمبەر (د.خ) زۆر شتن. لەوانە پەیداکردنی خزم‌و یارە، تا بە توانابێ بەرامبەر دوژمنانی ئیسلام و بتوانێ پەیامی خوا

یەکەم جار ژن هێنان بۆ پێغەمبەر (د.خ) بێ سنوور بووەو چەندی حەزبکردایە بۆی حەڵاڵ بووە بێنێ، بەڵام لە پاشدا بۆی دیاریکراو سنوری بۆ دانراو تەنها کەنیزەك بێ سنوور دانان مایەوە






هیچ کەس لە پیاو و ژنی موسوڵمان ڕێگەی سەرپشکیان نییە لە کارێك کە خواو پێغەمبەر بڕیاریان لەسەر دابێ‌و هەرکەسێ بە گوێی خواو پێغەمبەر نەکا ئەوا ڕێگەی بزرو ون کردووە

بەجێ بگەیەنێ، لەو شتانە موشەڕەف بوونی هەندێ عێلی عەرەب بە خزمایەتی‌و زاوایەتی پێغەمبەر (د.خ) دیسان لەو شتانە بەرپەرچ دانەوەی قسەی کافرەکان کە دەیانگوت پێغەمبەر (د.خ) جادووگەرەو خەڵکێکی ناعەرەب ئەم قسانەی فێردەکا.

لەوانەیە لە عادەت بەدەر لەگەڵ ژن نووستن لە کاتێکدا خواردنی کەم بووەو خواردنەوەشی کەم بووە، عەرەبیش خۆهەڵدەدەن و خۆهەڵدەکێشن بەوەی کە (کەم خۆر و زۆر پەڕن) ئەمەش لای عەرەب نیشانەی پیاوەتی تەواو و کەڵە مێردییە، وەك لە حەدیسی ئوممی زەرعدا هاتووەتە وتن.

جا ئەم حەدیسانە هەمووی بەڵگەی باوەڕ پێکراون لە پێغمبەر (د.خ) نۆ ژنی لەژێر سێبەر بووە لە یەك کاتداو پێکەوە، بێ لە کەنیزەك ئایەتی (25) لە سورەتی ئەلنیسائدا دەڵێ (و من لم یستطع ان ینکح المحصنات المؤمنات فمن ماملکت ایمانکم من فتیاتکم المؤمنات و الله اعلم بأیمانکم بعضکم من بعض فانکحوهن بأن اهلهن و آتوهن اجورهن) واتە کەسێك دەستی ئەوەندە درێژ نەبوو کە ژنی موسوڵمانی ئازادو پاك بێنێ با لەو ژنە دەسکەوتووانەی موسوڵمان بوون بێنێ‌و مارەشیان بکەن بە دەستوورو ڕێدانی خاوەنەکانیان و کرێی خۆشیان بدەنێ، واتە مارەییان بدەنێ. لێرەشدا ئایەت هەر ڕووی لە پیاو کردوە کە چۆن ژن بێنێ‌و چۆن ڕەفتاری لەگەڵدا بکا ئیتر هیچ ڕایەك بۆ ژن دیاری نەکراوە.

ئایەتی (27) لە سورەتی ئەلقەسەس دا دەڵێ (قال انی ارید ان انکحك احدی ابنتي هاتین علی ان تأجرني ثماني حجج) واتە شوعەیب پێغەمبەر بە موسای گوت: دەمەوێ یەکێك لەم دوو کچانەمت لێ مارە بکەم بە مەرجی هەشت شەرتان کارم بۆ بکەی. ئەم ئایەتە دەربارەی موسا پێغەمبەرو شوعەیب پێغەمبەر (س.ل) دەدوێ کە موسا لە میسر زەلامێکی کوشت و هەڵات و چوە ئەو شوێنە کە کچانی شوعەیب مەڕیان ئاودەداو موسایش یارمەتیدان لە ئاودانی مەڕەکان و شوعەیب کە زانی پیاوێکی چاکەو دەتوانێ یارمەتی بدا داوای لێکرد کە هەشت شەرتان لای بمێنێ‌و کاری بۆ بکا ئەویش لە بری ئەمە یەکێك لەو دوو کچەی بداتێ لێرەدا هیچ یەك لە کچەکان مافی هەڵبژاردن و ڕایان نەبووەو موسا سەرپشك بوە کە یەکێکیان هەڵبژێرێ، ئایەتی تریش لە قورئاندا نییە ئەم کارەی پێ خراپ بێ، لە پاشا ئەوانە هەردوکیان وەك لە قورئاندا دەڵێ نێردراوی پێغەمبەری خوابوون، بۆیە ئەم حوکمە خۆی دەمێنێ.

ئایەتی (36–37) لە سورەتی ئەلئەحزاب دەڵێ (و ما کان لمؤمن و لا مؤمنة اذا قضی الله و رسوله امرا ان یکون لهم الخیرة من امرهم و من یعص الله و رسوله فقد ضل ضلالا مبینا. اذ تقول للذي انعم الله علیه امسك علیك زوجك و اتق الله و تخفي ما في نفسك ما الله مبدیه و تخشی الناس و الله احق ان تخشاه. فلما قضی زید منها وطرا زوجناکها لکي لایکون علی المؤمنین حرج في ازواج ادعیائهم اذا قضوا منهن وطرا و کان امر الله مفعولا) واتە هیچ کەس لە پیاو و ژنی موسوڵمان ڕێگەی سەرپشکیان نییە لە کارێك کە خواو پێغەمبەر بڕیاریان لەسەر دابێ‌و هەرکەسێ بە گوێی خواو پێغەمبەر نەکا ئەوا ڕێگەی بزرو ون کردووە. ئەتۆ ئەی پێغەمبەر کە بەو کەسەی خواو خۆت چاکەتان لەگەڵدا کردووە دەڵێی نا نا ژنەکەی خۆت بگرەو بەرەڵای مەکە ئەوەی لە دڵی خۆتتا دەیشاریتەوە وا ئاشکرای ناکا لە خەڵکی دەترسی! لە خوا بترسی ڕاست ترە. کە زەید ماوەیەك لەگەڵ ژنەکەی ڕایی بواردو کاری پێنەما لە تۆمان مارەکرد بۆ ئەوەی ببێتە یاساو ڕێباز بۆ موسوڵمانان و ناشیرینی‌و شوێنی تانەو توانجی تێدا نەمێنێ ئەگەر موسوڵمانان ژنی ئەو کەسانە مارە بکەنەوە کە بە کوڕی خۆیانیان لە قەڵەم داون پاش ڕبواردنی ماوەیەك لە گەڵیاندا ئاوا دەبێ فەرمانی خوا جێبەجێ بکرێ.

وەك تەفسیری بەیزاوی دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی زەینەبەی کچی جەحش کە کچە پووری پێغەمبەرە (خوشکی باوکی) و ناوی ئومەییەی کچی عەبدولموتەلیب بووە. پێغەمبەر (د.خ) چووەتە خوازبێنی زەینەبە بۆ زەیدی کوڕی حاریسە کە پێشتر عەبد بووەو پێغەمبەر (د.خ) ئازادی کردووەو بە کوڕی خۆی ناو بردووە، جا زەینەبەو براکەی عەبدوڵڵا قبوڵیان نەکردووە، پاشان ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لەسەر فەرمانی خواو پێغەمبەر بۆیە قبوڵیان کرد وە زەینەبە

مێردی بە زەید کرد و پاش گواستنەوەی زەینەبە بۆ زەید بە ماوەیەك جارێك پێغەمبەر (د.خ) بە سەردان دەچێتە ماڵیان و کە چاوی بە زەینەبە دەکەوێت دەکەوێتە بەردڵی و دەفەرموێ (سبحان الله مقلب القلوب) واتە پاکی و گەورەیی بۆ ئەو خوایەیە کە دڵان دەگۆڕێ، زەینەبە ئەمەی گوێ لێدەبێ بۆ زەیدی دەگێڕێتەوەو زەیدیش لەمە دەگاو زەینەبەی لەبەرچاو و دڵ دەکەوێ دەچێتە لای پێغەمبەر (د.خ) بۆ ئەوەی زەینەبە تەڵاق بداو بە پێغەمبەر (د.خ) دەڵێ: دەمەوێ لە زەینەبە جیاببمەوە. پێغەمبەریش (د.خ) دەڵێ: بۆ هیچت لێ دیوە کە دڵت لێی پیس بێ. زەید دەڵێ: نە بە خوا لە چاکە بەولاوە هیچم لێ نەدیوەو هیچی لێ نابینم، بەڵام خۆی بە گەورەتر دەزانێ و لافم لەسەر لێدەدا، پێغەمبەریش (د.خ) بە زەید دەڵێ: هەر لەبەر ئەمە. نانا دەست لە ژنەکەت بەرمەدەو تەلاقی مەدەو لە خوا بترسە، بەڵام پێغەمبەر لە دڵدا پێی خۆش دەبێ کە زەید تەلاقی بدا زەیدیش لەگەڵ ئەوەش کە پێغەمبەر پێی دەڵێ: نانا تەلاقی مەدە. هەر سوور دەبێ لەسەر تەڵاقدانی و تەلاقی دەدا جا پاش تەواوبوونی چاوەڕوانی (عیددە)ی زەینەبە، پێغەمبەر بە زەیدی مێردی پێشووی زەینەبە دەڵێ: بچۆ بۆ لای زەینەبەو خوازبێنی بکەو پێی بڵێ بۆ من. زەیدیش دەچێتە لای زەینەبەو فەرمودەی پێغەمبەری پێ ڕادەگەیەنێ و ئەویش دەڵێ: جا لە فەرمانی خواو پێغەمبەر کێوە؟ و بەرفەرمانم و لە قسەی خواو پێغەمبەر دەرناچم. مارەیی زەینەبە لە ئاسمانەوە لە پێغەمبەر (د.خ) دەبڕدرێ و بەمە زەینەبە خۆی لەسەر ژنانی تری پێغەمبەر هەڵدەکێشاو دەیگوت ئێوە کەسوکارتان مارەی کردوون منیش خوا مارەی بڕیوم. واتە فەرمانی داوە بە بوونی زەینەبە بە ژنی پێغەمبەر (د.خ) بەبێ مارەکردنی ئاسایی و شایەت و شایەت کاری هەر لەم مەوزوعە سەحیحی موسلیم دەگێڕێتەوە دەڵێ (لما انقضت عدة زينب قال رسول الله (ص) لزيد فاذكرها علي قال فانطلق زيد حتى اتاها و هي تخمر عجينها قال فلما رايتها عظمت في صدري حتى ما استطع ان انظر اليها لأن الرسول (ص) ذكرها فوليتها طهري و نكصت على عقبي فقلت يا زينب ارسل رسول الله (ص) يذكرك قالت ما انا بصانعه شيئا حتى اوامرا ربي فقامت الى مسجدها و نزل القرآن و جاء رسول الله (ص) فدخل عليها بغير اذن) واتە کە چاوەڕوانی زەینەبە تەواو بوو پێغەمبەر بە زەیدی گوت بچۆ بۆلای زەینەبو بۆمی بخوازەو زەیدیش چووە لای زەینەبە لە کاتێکدا زەینەبە هەویری دەشێلا زەید دەڵێ: کە چاوم پێکەوت گەورە بوو لەبەرچاوم تاوەکو نەمتوانی تەماشای بکەم و پشتم تێکرد بەرەو پاش گەڕامەوەو گوتم زەینەبە پێغەمبەر ناوت دەبا ئەویش گوتی: من چ دەتوانم بکەم و بڵێم تا ئەمری خوا هەبێ و هەستاو چوە ژووری قورئان هاتە خوارێ و پێغەمبەر هات و چووە لای زەینەبە بەبێ پرس و بووە زەماوەندی پێغەمبەر (د.خ).

لەم ئایەت و حەدیسە دەرکەوت کە قازی شەرع (سەرداری وڵات) دەتوانێ ژنی بێسەردارو کەسوکار مارە بکاو هەروەها دەرکەوت کە بێوەژن ڕای وەردەگیرێ و پرسی پێدەکرێ. وەك پێغەمبەر (د.خ) ناردیە داخوازی زەینەبە بە هۆی زەیدی کوڕی حاریسەو مێردی پێشوی زەینەبە، ئەمە لە لایەك لە لایەکی تر دەرکەوت کە ژن تەڵاقدان پرسی پێناکرێ، چونکە ئەگەر پرسی پێویست بوایە پێغەمبەر (د.خ) بۆ کچە پوری دەیگوت با پرسی پێبکرێ لەسەر چیو بۆچی تەلاق دەدرێ و ئایا ڕازییە؟

هەر لەبەرئەوەی زەید دڵی لێی گوشرابوو چووە خزمەت پێغەمبەرو زەینەبەی تەلاقدا، لە کاتێکدا زەینەبە پێش بوونی بە ژنی زەید کە پێغەمبەر داخوازی کرد، خۆی و براکەی قبوڵیان نەکرد تا ئایەت هاتە خوارێ کە بە ناچاری مێردی پێکرد، واتە زەینەبە نە لە بەشودانی ڕای وەرگیراو نە لە تەلاقدان.

ئایەتی (24) لە سورەتی ئەلنیسائدا دەڵێ (و المحصنات من النساء الا ماملكت ايمانكم كتاب الله عليكم و احل ماوراء ذلك ان تبتاغوا باموالكم محصنين غير مسافحين فما استمتعم به منهن فاتوهن اجورهن) واتە ژنی بە مێردیش مارەکردنیان حەرامە جگە لەو ژنە مێرد دارانەی کە لە شەڕدا بەدیل گیراون ئەوان ئەگەر مێردەکانیشیان لە ژیاندا بن و نەکوژرابن ئەو ژنانە بۆتان حەلاڵن، جگە لەوانەی باسمان کردن کە حەرام و قەدەغەن و بە پیاو ناشێن ئەوانی تر

**لەم ئایەت و حەدیسە دەرکەوت کە قازی شەرع ( سەرداری وڵات ) دەتوانێ ژنی بێسەردارو کەسوکار مارە بکا**





حەڵاڵە بۆتان كە بیانخوازن بە ماڵ و دراوی خۆتان.

ئایەتی (49) سورەتی ئەلئەحزاب دەڵێ (یا ایها الذین آمنوا اذا نكحتم المؤمنات) واتە ئەی ئەوانەی موسوڵمان بوون ئەگەر ژنانی موسوڵمانتان هێنا. ئەمەش هەر ڕوو لە پیاو دەكات باسێك بۆ ژن نییە.

ئایەتی (50–52) لە سورەتی ئەلئەحزابدا دەڵێ (یا ایها النبي انا احللنا لك ازواجك اللاتي اتیت اجورهن و ما ملكت یمینك مما افاء الله علیك و بنات عمك و بنات عماتك و بنات خالك و بنات خالاتك التي هاجرن معك و امراة مؤمنة ان وهبت نفسها للنبي ان اراد النبي ان یستنكحها خالصة لك من دون المؤمنین قد علمنا مافرضنا علیهم في ازواجهم و ما ملكت ایمانهم لكیلا یكون علیك حرج و كان الله غفورا رحیما. نرجيء من تشاء منهن و تؤوي الیك من تشاء و من ابتغیت ممن عزلت فلا جناح علیك ذلك ادنى ان تقر اعینهن ولا یحزن و یرضین بما اتیتموهن كلهن و الله یعلم ما في قلوبكم و كان الله علیما حكیما. لایحل لك النساء من بعد و لا ان تبدل بهن من ازواج و لو اعجبك حسنهن الا ما ملكت یمینك و كان الله على كل شيء رقیبا) واتە ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە بۆ تۆمان حەڵاڵ كرد ئەو ژنانەی كرێی مارەییت داونەتێو ئەو ژنە كەنیزەكانەی كڕیوتن و دەستت كەوتوون لەوانە خودا بە تاڵان داویە پێت و هەروەها كچانی مامت و كچانی پورت و خوشكی باوك) و كچانی خاڵۆت و كچانی پورت (خوشكی دایك) لەوانەی لە گەڵتا كۆچیان كردووە، هەروەها ژنێكی موسوڵمان كە خۆی بە پێغەمبەر ببەخشی بەبێ مەرجی مارەییو پێغەمبەریش ئارەزووی هێنانی بكا، ئەمەیان تەنها بۆ تۆیە و بۆ موسوڵمانانی تر نا، ئێمە دەزانین چیمان لەسەر پێویست كردوون بەرامبەر بە ژنانی موسوڵمانی ئازاد (كە كرێی مارەییەو بە نسبەت كەنیزەكیش كڕینە) ئەمەش بۆ ئەوەی لە سەرت نەبێتە قسەو ڕەخنەو ئازار بۆت. ئەوانەی باسكرا ئەوەی حەزبكەی دوای دەخەی نەهێنێ یان لەگەڵی نانویت و ئەوەی ئارەزوویشی بكەی دەهێنیو بەخۆتی دەگریو لەگەڵی دەنوی، یان كامەیان حەزبكەی تەلاقی دەدەیت و كامیان حەزبكەی دەیهێڵیتەوەو ئەوەی تەڵاقی ڕەجعیت داون بخوازی بیان گێڕیتەوە هیچ گوناحێكی تێدا نییە،

ئەم سەرپشكییە لەبەرچاو و دڵی ئەوانەو ئەوانیش دەبێ دڵخۆشبن بەوەی داونەتێ لە كرێی مارەییو نابی خەمناك بن، ئیدی لە مەودوا ژنی تر بێنیت یا بیانگۆڕی بە ژنی تر (وەك یەكێ تەلاق بدەیو یەكێكی كە مارە بكەیت) با زۆریشت پێ جوان و لەباربن تەنها كەنیزەك نەبێ ئەوەت بۆ دروستە. لەم ئایەتەش دەركەوت كە (ڕا) هەر ڕای مێردەو ژن هیچ دەسەڵاتێكی نییە، لەم ئایەتە كە ڕوو لە پێغەمبەر (د.خ) و پێغەمبەریش پێشڕەوی موسوڵمانانە، هەر ژنێك خۆی پێشكەش پێغەمبەر (د.خ) بكا ئەگەر پێغەمبەر حەزی لێبكاو نەكاو نەڵی باشە سەرناگرێ. دیسان پیاو مافی ئەوەی هەیە بەبێ لەبەرچاوگرتنی هیچ هۆیەك تەنها بۆ دابین كردنی ئارەزووی خۆی جنسیو هیچی تر نا ژنی خۆی تەلاق بداو ژنێكی تر مارەبكا، ئەگەر چوار ژنی هەبێ یا هەر چواریان یان هەندێكیان تەلاق بداو بە ئەندازەی تەلاقدراوان ژنی تازە مارە بكات. ژیانی پیاودا سنوور بۆ ئاڵوگۆڕی دانەنراوە چەند جار دەیكا یان نایكا، بە ئارەزووی پیاو خۆیەتیو ژن هیچ مافێكی نییە تەنها مارەییو نان دانیان نەبێ لە كاتی تەڵاقدان دەبێ بیاندرێتێو لێیان نەسەنرێتەوە ئەگەر پێشتر وەریان گرتبوو. جگە لەمانە كە ژنی ئازاد، پیاو دەتوانێ كەنیزەك (جارییە) بكڕێ هەرچەندە بیەوێ لە گەڵیشیان ڕابوێرێ سەرباری ژنە ئازادەكانی خۆی. لێرەدا وەك تا ئێستا دیمان. قورئان بۆ ژن هێنان هەر ڕوو لە پیاو و مێرد دەكات و هیچ ڕوویەكی نەداوەتە ژن، جا با بزانین كردارو گوفتارو ڕەفتاری پێغەمبەر (د.خ) و یاوەرەكانی چۆنن و چی دەڵێن.

سەحیحی موسلیم ڕوایەت دەكاو دەڵێ (حدثنا سعید من منصور و قتیبة بن سعید قال حدثنا مالك و حدثنا یحی بن یحی (و اللفظ) قال قالت لمالك حدثك عبدالله بن الفضل عن نافع بن جبیر عن ابن عباس عن نبي (ص) قال الٲیم احق بنفسها من ولیها و البكر تستأذن في نفسها اذنها صماتها. قال نعم) واتە پێغەمبەر (د.خ) گوتویەتی بێوەژن بۆ خۆی لە پێشترە لە سەردارەكەی بەڵام كچ پرسی پێدەكرێو ڕالێبوونەكەشی بێدەنگ بوونیەتی. لەم ڕووەوە زۆر ڕوایەت هەیەو هەموو لە داڕشتندا جیاوازن بەڵام لە مەبەست و مەعنا

پیاو مافی ئەوەی هەیە بەبێ لەبەرچاوگرتنی هیچ هۆیەك تەنها بۆ دابین كردنی ئارەزووی خۆی جنسیو هیچی تر نا ژنی خۆی تەلاق بداو ژنێكی تر مارەبكا، ئەگەر چوار ژنی هەبێ یا هەر چواریان یان هەندێكیان تەلاق بداو بە ئەندازەی تەلاقدراوان ژنی تازە مارە بكات

هەموویان یەکن. لێرەشدا کاتێکی کەسێك بێت بۆ داخوازی ئەگەر بێوەژن بێ بە قسە (ڕا)ی خۆی بەدەردەخا، بەلاَم کچ ئەگەر لێیان پرسی (مێردی پێ دەکەی) هەر بێدەنگ دەبێ واتە ڕازی بوونیەتی. (حدثنا ابو كريب محمد بن العلاء حدثنا ابو اسامة و حدثنا ابوبكر ابي شيبة قال وجدت في كتابي عن اسامة عن هشام عن ابيه عن عائشة قالت: تزوجني رسول الله (ص) لست سنين بني بي و انا بنت تسع سنين قالت فقدمنا المدينة فوعك شهرا فوفى شعري فأتتني ام رمان و انا على ارجوحة و معي صواحبي فصرخت بي فأتيتها و ما ادريت ما تريد بي فأخذت بيدي فأوقفت على الباب فقلت هه هه حتى ذهب نفسي فأدخلتني بيتا فاذا نسوة من الأنصار فقلن على الخير و البركة و على الخير و طائر فاسلمتني اليهن فغسلن رأسي و اصلحني فلم يرعني الا و رسول الله (ص) ضحى فاسلمنني اليه) واتە عائیشە دەڵی من کە لە پێغەمبەر مارە کرام تەمەنم شەش ساڵان بوو کە منیان گواستەوە بۆ پێغەمبەر (د.خ) تەمەنم نۆ ساڵان بوو، عائیشە دەڵێ: کە هاتینە مەدینە گرانەتام گرت و هەموو مووی سەرم هەڵوەری‌و سەرلەنوێ هاتەوە تا گەیشتە ناوشانم من و هاوەڵەکانم لەسەر جۆلانە یاریمان دەکرد کە دایکی ڕومان (دایکی عائیشە) هاواری لێکردم و بانگی کردم نەمزانی چی لێم دەوێ‌و دەستی گرتم لەسەر دەرگایەك منی ڕاگرت و منیش گوتم هاها هاتمەوە سەرخۆو بردمیە ماڵێك هەندێ ژنی ئەنساری لەوێ بوون وتیان بەخێرو خشییەوە بەختێکی چاك، منی دایە دەست ئەوان و ئەوانیش سەریان شوشتم و ڕێکوپێکیان کردم و چێشتانگا دامیانە دەست پێغەمبەر (د.خ).

لە حەدیسێکی تردا عائیشە دەڵی پێغمبەر (د.خ) لە حەوت ساڵیدا مارەی کردم و لە نۆ ساڵیمدا گواستمیەوەو یارییەکانی (بوکۆکەو یاری منداڵانی تر) لە گەڵیدا گوازراوەتەوە لە هەژدە ساڵیمدا پێغەمبەر (د.خ) بە جێی هێشتووم و کۆچی دوایی کردووە.

جا پێغەمبەر (د.خ) کە کۆچی دوایی کردووە تەمەنی (63) ساڵ بووە عائیشە تەمەنی هەژدە ساڵ بووەو کە بۆشی گوازراوەتەوە تەمەنی (54) ساڵ بووە، دەی ئەو نوسەرو چیرۆکنوسانەی کچی گەنج مارەکردن لە پیاوی پیر پوچەڵ دەکەنەوە لە کوێن؟ ئەوجا کوا (ڕا)ی عائیشەو پرس پێکردنی لە مێرد کردنی؟

حەدیسێکی تر دەڵێت (حدثنا قتيبة بن سعيد الثقفي حدثنا يعقوب يعني ابن عبدالرحمن القاريء عن ابي حازم عن سهل بن سعد و حدثنا قتيبة حدثنا عبدالعزيز بن ابي حازم عن ابيه عن سهل بن سعد الساعدي قال جاءت امرأة الى رسول الله (ص) فقالت يا رسول الله جئت اهب نفسي فنظر اليها رسول الله 0ص) فصعد النظر فيها و صوبه ثم طأطأ رسول الله (ص) راسه فلما رات المرأة انه لم يقض فيها شيئا جلست فقام رجل من اصحابه فقال يا رسول الله ان لم يكن لك بها حاجة فزوجننيها فقال فهل عندك من شيء فقال لا و الله يا رسول الله ما وجدت شيئا فقال (ص) انظر و لو خاتما من حديد فذهب ثم رجع فقال لا و الله يا رسول الله و لا خاتما من حديد و لكن هذا ازاري (قال سهل ماله رداء) فلها نصفه فقال رسول الله (ص) ما تصنع بأزرارك ان لبسته لم يكن عليها منه شيئا و ان لبسته لم يكن عليك منه شيء فجلس الرجل حتى اذ طالت مجلسه قام فرآه رسول الله (ص) موليا فأمر به فدعى فلما جاء قال ماذا معك من القرآن قال معي سورة كذا و سورة كذا (عددها) فقال تقرؤهن عن ظهر قلبك قال نعم قال اذهب فقد ملكتها به معك من القرآن. هذا حديث ابن ابي حازم و حديث يعقوب يقاربه اللفظ). واتە ژنێك هاتە لای پێغەمبەر (د.خ) گوتی ئەی پێغەمبەری خودا خۆم بە تۆ دەبەخشم پێغەمبەریش (د.خ) تەماشای قەدوباڵای کرد واتا چاوی بڵند کردو دوایی نەویکرد لە پاشان سەری داخست ژنەکە دیتی هیچی بۆ جێبەجێ نەکرا دانیشت، یەکێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر هەستاوەو گوتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر ناتەوێ لە منی مارە بکە، پێغەمبەریش گوتی چیت هەیە گوتی بچۆ ماڵەوە بگەڕێ، پیاوەکە چووە ماڵ‌و هاتەوە گوتی نە بەخوا هیچم دەست نەکەوت، گوتی بچۆ بگەڕێ ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ، دیسان چوو هاتەوە گوتی، نە بەخوا ئەویشم چنگ نەکەوت، بەلاَم ئەم کراسەم هەیە (سەهل گوتی چۆن کراسێك؟!) نیوەی دەدەمێ پێغەمبەر (د.خ) گوتی چی لە نیوە کراس دەکەی ئەگەر تۆ لە بەری کەی هیچ بەر ئەو ناکەوێ‌و ئەگەر ئەو

لە حەدیسێکی تردا عائشە دەڵی پێغمبەر (د.خ) لە حەوت ساڵیدا مارەی کردم و لە نۆ ساڵیمدا گواستمیەوەو لە هەژدە ساڵیمدا پێغەمبەر (د.خ) بە جێی هێشتووم و کۆچی دوایی کردووە






لەبەری بکا هیچت بەرناکەوێ تا دانیشتنەکە درێژەی کێشا لە پاشان هەستاو ڕۆیی لەو کاتەدا پێغەمبەر دیتی وا دەڕوا فەرموی بانگی بکەن و بگەڕێتەوە، کە هاتەوە پێغەمبەر گوتی چیت لە قورئان پێیە؟ گوتی بەڵی ئەو سورەتەو ئەم سورەتە (ژماردنی) پێغەمبەر (د.خ) گوتی هەموویت لەبەرن؟ گوتی بەڵێ. پێغەمبەر گوتی: برۆ ئەوا دامەتۆ بەوەی لەبەرتە لە قورئان.



لێرەشدا ژنە پرسی پێنەکرا ئایا پیاوەی دەوێ یان نایەوێ تەنها ئەوەبوو کە خۆی بە پێغەمبەر (د.خ) بەخشیبوو ئیتر پێغەمبەر (د.خ) بوو بە سەرداری ژنەو دایە ئەو پیاوە بە خوێندنی قورئان کە مارەیی ژنە فێربوونی قورئان بووە.

حەدیسێکی تری سەحیحی موسلیم لاپەڕە (145) جزمی چوارەم دەڵی (حدثني زهير بن حرب حدثنا اسماعيل يعني ابن عليه عن عبدالعزيز عن انس ان رسول الله (ص) غزا خيبر قال فصلينا عندها صلاة الغذاة فركب النبي (ص) و ركب ابو طلحة و انا رديف ابي طلحة فأجرى نبي الله (ص) في زقاق خيبر و ان ركبتي لمس فخذ النبي الله (ص) و انحسر الازرار عن فخذ نبي الله (ص) فاني لأرى بياض فخذ نبي (ص) فلما دخل القرية قال الله اكبر خربت خيبر انا اذا نزلنا بساحة قوم فساء صباح المنذرين قالها ثلاث مرات قال و قد خرج القوم الى اعمالهم فقالوا محمد و الله قال عبدالعزيز و قال اصحابنا (محمد و الخميس) قال و اصبناهم عنوة و جمع السبى فجاءه دحية فقال يا رسول الله اعطيني جارية من السبي فقال اذهب فخذ جارية. فأخذ صفية بنت حيى فجاء رجل الى النبي (ص) فقال يا نبي الله اعطيت دحية (صفية9 بنت (حيى) سيد قريظة و النضير؟ ما تصلح الا لك قال ادعوه بها قال فجاء بها فلما نظر اليها النبي (ص) قال خذ جارية من السبي غيرها، قال و اعتقها و تزوجها فقال له ثابت يا ابا حمزة ما اصدقها قال نفسها اعتقها و تزوجها حتى اذا كان بالطريق جزتها ام سليم فأهدتها له من الليل فأصبح النبي (ص) عروسا فقال من كان عنده شيء فليجيء به قال و بسط نطحا قال فجعل الرجل يجيء بالاقط و جعل الرجل يجيء بالتمر و جعل الرجل يجيء بالسمن محاسوا حيسا فكان وليمة رسول الله (ص)..) واتە لە بەسەردا دانی خەیبەردا پێغەمبەر سواربوو منیش لە پشت ئەبی تەلحە سواربووم و بە کۆڵانەکانی خەیبەدا دەڕۆشتین ئەژنۆم لە ڕانی پێغەمبەر (د.خ) دەخشاو کراسەکەی هەڵماڵی تا سپایەتی ڕانی پێغەمبەر (د.خ) بەدیارکەوت، کە چوینە ناو گوند، پێغەمبەر گوتی: با خەیبەر کاول بێ، ئێمە لە مەیدانی هەر نەتەوەیەك و کۆمەڵێك دابەزین ڕۆژی ڕەشیان بێ. ئەمەی سێ جار گوتەوە گوتیان بە خوا ئەمە موحەمەدو سوپاکەیەتی، ئێمە لێماندان سەرکەوتین و گرتمانن و تاڵان و ژنە بە دیل گیراوەکانمان کۆکردەوە (دەحیە) هاتە لای پێغەمبەر (د.خ) گوتی کەنیزەکێکم بدەرێ لەو ژنە تاڵانیانە، گوتی برۆ یەکێك بەرە بۆ خۆت، ئەویش چوو (سەفیە)ی کچی (حویەی) هەڵبژارد، پیاوێك هاتەلای پێغەمبەر گوتی ئەی پێغمبەری خوا (سەفیە) کچی (حەیەی) گەورەی قورەیزەو نەزیرت دا بە (دەحیە)؟ ئەو کچە بۆ تۆ نەبێ بۆ کەس دەست نادات پێغەمبەر فەرمووی بانگیان کەن، کە سەفیەیان هێناو چاوی پێکەوت گوتی برۆ جاریەیەکی تر بۆ خۆت بەرە، جا پێغەمبەر (د.خ) سەفیەی ئازاد کردو لە خۆی مارە کرد، (سابیت) بە (ئەبا حەمزە)ی گوت مارەیی سەفیە چی بوو؟ گوتی ئازادکردنی و مارەکردنی، ڕیوایەتی تر هەیە دەڵی سەفیە لە دابەشکردنی تاڵانی بەسەر شەڕکەراندا بەر دەحیە کەوت پێغەمبەر (د.خ) بە حەوت سەر لێی کڕیەوە. لە ڕێوایەتێکی تردا دەڵی سەفیە بەر دەحیە کەوت و حەڵکی زۆریان بە جوانی هەڵدەدا کە شتی وا جوان و لەبار لەناو ژنانی تاڵانی نەبینراوە، پێغەمبەریش ناردیە دوای دەحیەو بە وەندەی ویستی لێی کڕیەوە، ئەنجا سەفیەی ناردە لای (ئوممی سەلەیم) بۆ ئامادەکردنی ئەویش ڕازاندییەوەو ئامادەی کردو بە شەو بۆ پێغەمبەری بردو پێغەمبەر بوو بە زاواو گوتی هەرکەس چی هەیە با بیهێنێ، جا هەبوو ڕۆنی هێناو هی وا هەبوو کەشکی هێنا هەندێکی تر خورمایان هێنا سفرە داخراو تێکەڵ کران و بوو بە زەماوەندی پێغەمبەر (د.خ) خەڵکەکە تێریان خواردو دەیانگوت نەماندەزانی پێغەمبەر سەفیەی کردووە بە ژنی خۆی یا هەروەکو کەنیزەکە، دوایی گوتمان ئەگەر پێغەمبەر

سەفیەی داپۆشت ئەوا دیارە کردوویە بە ژنی خۆیو ئەگەر هەروەکو خۆی هێشتیەوەو دانەپۆشت ئەوە دیارە وەکو کەنیزەکی وەرگرتوە. لە پاشان کە ویستی سواربێ (سەفیەی) داپۆشت و لە پشت پێغەمبەر سواری حوشتر بوو، ئەو کاتە خەڵکەکە زانیان کە مارەی کردووە بووەتە ژنیو کەنیزەك نییە، جا کە نزیك کەتینەوە لە مەدینە پێغەمبەر پەلەی کردو دایە غار ئێمەش دامانە غارو حوشترەکەی پێغەمبەر سەرسمی داو پێغەمبەر کەوتە خوارو ئەویش کەوتە خوارو پێغەمبەر (د.خ) هەستاوە سەفیەی داپۆشت، ژنانی مەدینە کە ئەوەیان دی گوتیان: خوایە ژنە جولەکەمان لێ وەدووربخا. دەڵی گوتم ئەبو حەمزە ئایا پێغەمبەر (د.خ) کەوت؟ گوتی ئەرێ وەڵا کەوت. لەم کردارە دەردەکەو کە ژن بە تایبەت ژنێك لە شەڕدا بە تاڵانی گیرابێ هیچ مافێکی نییەو دابەشدەکرێ بە بێ ویستی خۆی وەك کوتاڵ و کەلوپەلی تاڵانی گیرابی، دەکڕدرێو دەفرۆشرێ و دەبەخشرێو ژنە هیچ مافێکی نییە وەك هەر کوتاڵێکی بێزمان بەرفەرمان بو بێ چەندو چوون و ژنە بەمێردبێ یان بێ مێرد.

حەدیسێکی تر دەڵێ (حدثنا یحی بن ایوب و قتیبة بن سعید و علي بن حجر قالوا حدثنا اسماعیل بن جعفر اخبرني ربیعة عن محمد بن یحیی بن حیان عن عمر ابن محیریز انـــه قال دخلت انا و ابو صرمة علی سعید الخدري فساله ابو صرمة فقال یا ابا سعید هل سمعت رسول الله (ص) یذكر العزل فقال نعم: غزونا مع رسول الله (ص) غزوة بلمصطلق فسبینا كرائم العرب فطالت علینا العزبة و رغبنا في الفداء فأردنا ان نستمتع و نعزل فقولنا نفعل و رسول الله اظهرنا لانسأله فسألنا رسول الله 0ص) فقال لا علیكم ان لا تفعلوا ما كتب الله خلق نسمة هي كائنة الی یوم القیامة الا ستكون) واتە لە بەسەرداداني بەني موستەلەق گەورە ژنانی عەرەبمان بە تاڵان گرتن و دەمێکیش بوو ڕەبەن بووین لە ژنانمان دوور بووین ویستمان ڕابوێرین لەگەڵ ئەو ژنە بە دیل گیراوانە بەڵام لە منداڵ بوونیان دەترساین بۆیە گوتمان ڕادەبوێرین و ئاویان تێناکەین لە پاشان گوتمان پێغەمبەرمان لەگەڵدایە و لێی ناپرسین؟ لێمان پرسی گوتی بۆ وا دەکەن، بە دڵی خۆتان بکەن و لە دەرەوەی مەکەن، ئەوەی خوا بییەوێ دروستی بکا دەیکا ئەگەر لە دەرەوەش بێ. لێرەدا دەردەکەوێ کە ژنی بە دیل گیراو و تاڵانی با عەرەبیش بێ کە ڕەگەزی خۆیان بووە جیا نەدەکرایەوەو هەمان ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرا کە لەگەڵ بێگانە کراوەو دەکرا ژنە هیچ ڕایەکی نییەو بەر کەس کەوتبێ بە ئارەزووی خۆی لە گەڵی ڕایبواردووە ژنە ویستبێتی یان نا مێردی هەبووبێ یان نا، هەرکاتێك پیاو ویستبێتی فرۆشتوویەتی.

(حدثنا عبیدالله بن عمر بن مسیرة القواریري حدثنا یزید بن زریع حدثنا سعید بن ابي عروبة عن قتادة عن صالح ابي الخلیل عن ابی علقمة الهاشمي عن ابي سعید الخدري ان رسول الله (ص) یوم حنین بعث جیشا الی اوطاس فلقوا عدوا فقابلوهم فظهروا علیهم و اصابوا لهم سبایا فكان ناسا من اصحاب الرسول (ص) تحرجوا من غشیانهن من اجل ازاجهن من المشركین فأنزل الله عزوجل في ذلك (و المحصنات من النساء الا ماملكت) ای فهن حلال لكم اذا انقضت عدتهن).

واتە دەڵی پێغەمبەر (د.خ) لەشکری کردە سەر (ئەوتاس) کە جێگەیەکە لە لای تائف و گەیشتنە دوژمن و بەشەڕ هاتن و موسوڵمانان سەرکەوتن و ژنیان لێ بە تاڵان گرتن، هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر دەیانویست لەگەڵ ژنەکان ڕابوێرن، بەڵام دەترسان کە گوناح بێت چونکە ژنەکان مێردیان هەبوو واشیان دەزانی ژنی بە مێرد دروست نییە لەگەڵیدا ڕابوێری بە تاڵانیش بێ، جا خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ کە دەڵێ (ژنی بەمێردیش دروست نییە مەگەر تاڵان بێ) واتە ژنی بە دیل گیراو حەڵاڵە بۆتان چونکە پەیوەندیان لەگەڵ مێردیان دەبڕێت بە بوونیان بە دیل و تاڵانی بۆیە بۆ موسوڵمانان دروستە لە گەڵیاندا ڕابوێرن پاش تەواوبوونی چاوەڕوانی (سێ مانگە) یان.

حەدیسێکی تر (حدثنا زهیر بن حرب و محمد بن مثنی و عبیدالله بن سعید عن عبیدالله بن سعید اخبرني سعید بن ابي سعید عن ابي هریرة عن النبي (ص) قال تنكح المرأة لأربع لمالها و لحسبها و لجمالها و لدینها فأظفر بذات الدین تربت یداك) واتە ژن لەبەر چوار شت خوازبێنی دەکرێ لەبەر دارایی‌و بنەماڵەی و جوانی‌و لەبەر دینی، ئەتۆ بە دینەکە هەڵبژێرە دەستت دەردنەکا.

لێرەدا پێغەمبەر ڕووی لە پیاو کردووە کە داخوازی ژن بکەن لەبەر ئەو شتانەی باسکران ئەگەر ژنیش مافی هەڵبژاردنی هەبوایە دەبوو بۆ ئەویش شتێك بوترایە کە دەتوانێ مێردی هەڵبژێرێ لەبەر لاوچاکی‌و ئازایەتی‌و هەبووەیی و جێگەو ڕێگەی بەڵام کە هیچ باسێك بۆ ئەم نییە دیارە مافی ژن هەر مارەیی وەرگرتن و ناندانییەتی.

ئەگەر ژنیش مافی هەڵبژاردنی هەبوایە، دەبوو بۆ ئەویش شتێك بوترایە کە دەتوانێ مێردی هەڵبژێرێ لەبەر لاوچاکی‌و ئازایەتی‌و هەبووەیی و جێگەو ڕێگەی



# فیقهی ئیمامی شافیعی دەربارەی مارەکردن




**هەر ژنێك بە بێ پرسی سەرداری خۆی مێرد بکاو خۆی مارەکا مارەییەکە پووچ و بەتاڵە**

الأم الجز الخامس ص (13) (اخبرنا مسلم و سعید و عبدالمجید عن ابن جریح عن سلیمان بن موسی عن ابن شهاب عن عروة بن الزبیر عن عائشة ان رسول الله 0ص) قال ایما امرأة نکحت بغیر اذن ولیها فنکاحها باطل فنکاحها باطل فنکاحها باطل فأن اصابها فلها الصداق بما استحل من فرجها) واتە هەر ژنێك بە بێ پرسی سەرداری خۆی مێرد بکاو خۆی مارەکا مارەییەکە پووچ و بەتاڵە ئەگەر مێردەکە چوو بووە لای ژنەو لەگەڵیدا نوستبوو ئەوە مارەیی دەکەوێتە سەر لە جیاتی ئەو لەگەڵ نوستنە.

(لا نکاح الا بولي و سلطان ولي من لاولي لە) ئیمامی شافیعی دەڵێ بە بێ کەس و سەردار مارەیی نایێ و ئەو کەسەی بێ سەردارە، سەرداری ولات سەرداریەتی بەڵگەی ئیمامی شافیعی بۆ ئەمە ئایەتی (و اذا طلقتم النساء فبلغن اجلهن فلا تعضلوهن ان ینکحن ازواجهن) و ئایەتی (الرجال قوامون علی النساء) و ئایەتی (فانکحوهن بأذن اهلهن) و حەدیسی موسلیم و سەعید (ایما امرأة نکحت بغیر اذن ولیها فنکاحها باطل.. الخ) هەر ژنێك بە بێ پرس و ئاگاداری سەرداری خۆی خۆی مارەبکا مارەییەکە بەتاڵە.

(قال الشافعي فأي ولي امرأة ثیب او بکر زوجها بغیر اذنها فالنکاح باطل الا الآباء في الأبکار و السادة في الممالك) واتە سەرداری هەر ژنێك چ کچ چ بێوەژن مارەیان بڕن بێ پرسیاریان مارەییەکە پوچ و بەتاڵە تەنها باوك نەبێ لە مارەکردنی کچی خۆیو خاوەن کەنیزەك نەبێ لە کەنیزەك، ئەوان دەتوانن بەبێ پرس پێکردنیان مارەیان بکەن لە هەرکەسێ حەزبکا.

(قال الشافیعي: فأی امرأه نکحت بغیر اذن ولیها فلا نکاح لها) واتە هەر ژنێك بەبێ سەرداری خۆی، خۆی مارەکرد مارەییەکە بەتاڵەو مارەی نایێ. وەلی سەردار ئەمانەن: باوك، لەگەڵ باوکدا کەس مافی نییە، ئەگەر باوك نەبوو باپیر (باوکی باوك) ئەگەر نەبوو باپیرە گەورە (باوکی باپیر) پاش ئەمانە ئینجا برای دایکو باوکی، ئەوجا ئەگەر برای دایك و باوکیو برای بابی کۆبوونەوە برای دایك و باوکی لە پێشترە ئەگەر برای داك و باوکی نەبوو برای لە باوك لە پێشترە لە هی تر ئەگەر کەس لە کوڕە مام لە پێشتر نەبوو کوڕە مام دەبێتە سەردار.

قال الشافیعي: لأبي البکر ان یزوجها صغرة و کبیرة بغیر امرها واجب الی ان کانت بالغا ان یستأمرها) لە کتێبی ئەلئومدا کە مەزهەبی ئیمامی شافیعییە وا نوسراوە. لە کتێب (مغني المحتاج الی معرفة معاني الألفاظ المنهاج شرح الشیخ محمد الشربینی الخطیب، عین من اعیان علماء الشافعیة في قرن العاشر الهجري علی متن المنهاج لأبي زکریا یحی بن شرف النووي من اعلام علماء الشافعیة في قرن السابع المیلادي) دا لە باسی مارەکردن و ژن هێناندا لە لاپەڕە (149)دا دەڵێ (و للأب ولایة اجباریة و هي تزویج ابنته البکر الصغیرة او کبیرة عاقلة او مجنونة ان لم یکن بینه و بینها عداوة ظاهرة، بغیر اذنها لخبر الدار قطني (الثیب احق بنفسها من ولیها و البکر یزوجها ابوها) روایة مسلم و یستحب استئذانها أي البکر اذا کانت مکلفة لحدیث مسلم لسابق و تطبیقا لخاطرها اما غیر المکفلة فلا اذن لها و الجد کالأب عند عدمه في الأصح و من علی حاضیة کاخ و عم لایزوج صغیرة بحال و تزویج الثیب البالغة بصریح الأذن و یکفي في البکر سکوتها في الأصح، و احق الأولیاء اب ثم جد ثم ابوه ثم اخ الأبوین او الأب ثم ابنه و ان سفل ثم عم ثم سائر العصبة کالأرث) واتە باوك سەرداری سەپێنەرە لە مارەکردنی کچی خۆی بچوك یان گەورە هۆشدار یان شێت بێ بێپرس، ئەگەر لە نێوان باوك و کچەدا ناخۆشیەکی دیارو ئاشکرا نەبوو، لەبەر حەدیسی کە دارقوتی گێراویەتەوەو دەڵێ: بێوەژن خۆی لە پێشترە لە سەرداری و کچیش باوکی

مارە دەکا ڕیوایەی سەحیحی موسلیمە. بەڵام ئەگەر کچە خۆی خۆی ناسبێ و عازەب بوو پرسی پێبکرێ باشە لەبەر هەمان حەدیسی پێشەوەو لەبەر دڵی کچەکە خۆی بەڵام ئەگەر منداڵ بوو پرسی پێناکرێ و مارە دەکرێ.

(وەلی) سەردار: باپیر (باوکی باوک) وەك باوك وایە ئەگەر بوك نەبوو ئەوەی لە بنەماڵەشن وەك براو مام بە هیچ جۆرێك ناتوانن بچوك مارەبکەن، بێوەژنی خۆناسیو بە پرسی ئاشکرا مارەدەکرێ، ڕا وەرگرتنی کچ لە مارەکردن بێدەنگ بوونیەتی.

پلەی (وەلی) سەردار لە هەمووان لە پێشتر باوکە باپیر ئەنجا باپیرە گەورە ئەوجا برای دایکوباوکی ئینجا برای لە باوك ئەوجا کوڕی برا هەتا بچێتە خوار لە پاشا مام ئینجا ئەوانی تر وەك لە میراتدا.

موغنی ئەلموحتاج جزمی شەشەم لاپەڕە (141) دەڵێ (و لو قال زوجني ابنتك فقال الولي زوجتك او قال الولي للخاطب تزوجها أي بنتي فقال الخاطب تزوجت، صح النكاح في المسألتين و لا يصح تعليقه، و لو بشر بولد فقال ان كان انثى فقد زوجتكها فألمذهب بطلانه) واتە ئەگەر داخوازیکەری کچە بە باوکی کچەی گوت کچەکەتم بدەرێ و لێم مارە بکەو باوکی کچە گوتی باشە وا لێم مارە کردی، یا سەرداری کچە بە داخوازیکەری گوت کچەکەم مارەبکە ئەویش گوتی باشە مارەم کرد مارەییەکە لە هەردوو حاڵەتدا دێ و دروستە بەڵام دروست نییە مارەی بە شتێکەوە ببەسرێتەوە وەك ئەگەر مژدە درا بە باوك کە منداڵێکیان بووە، بڵێ ئەگەر منداڵەکە مێ بوو. ئەوا دامەتۆو لە تۆم مارەکرد ڕاست لە مەزهەب ئەوەیە ئەم جۆرە مارەییە پووچە هەروەها مارەکردنی کاتی (بۆ ماوەیەك) و ژن بە ژن ئەگەر ژنەکان خۆیان لە جیاتی مارەیی (کرێدان) درابن بە یەکتری بەڵام ئەگەر مارەیی بۆ هەریەکەیان دیاریکرابێ دروستە.

(و للمجبر المولیته التوكيل في التزويج بغير اذنها كما يزوجها بغير اذنها لاكن يسن له اسئذانها و يكفي سكوتها و لا يشترط في جواز توكيل المجير تعيين الزوج للوكيل في الأظهر، لأنه لايملك التعيين في التوكيل فيملك الأطلاق كما في البيع و سائر التصرفات و يحتاط الوكيل فلا يزوج في غير الكفء) واتە سەرداریێ کە زۆری لە دەستە وەك باوك و باپیرو باپیرە گەورە) دەتوانێ وەکیل بگرێ بۆ مارەکردنی کچەکەی و هەموو مافێکی باوك هەیەتی لە ڕووی مارەکردنی بێپرس و وەکیلیش ئەو مافەی دەبێ دەتوانێ کچە مارەبکا بەبێ پرس، بەڵام باشە ئەگەر پرسی پێبکاو ڕازیبوونی کچەش لەم حاڵەتەدا بێدەنگ بوونیەتی، مێرد دیاریکردن لە لایەن باوکەوە مەرج نییە لەم وەکالەتەدا وەك بڵێ کچەکەم بدە بە فلانە کەس. کە وەکالەتی وەرگرت هەموو شتێك دەتوانێ بکا وەکو وەکالەتی کڕین و فرۆشتن و شتی تر، بەڵام چاك وایە وەکیل کچەکە لە هاوتای خۆی نەبێ مارە نەکا.

ئەمەیە بڕیاری فیقهی ئیسلامی لە بارەی مارەکردنی ژن و چۆنیەتی بەشوودان، ئیدی ئەو کەسانەی دەڵێن (ئایینی ئیسلام مارەکردنی بێپرس و مارەبڕینی سەر لانکە پووچەڵ دەکا) نازانم لە کام ئایین و دینیان وەرگرتووە؟ ئەوەتا بە ئاشکرا دین دەڵێ (کچی بچوك و منداڵ مارەدەکرێ هەڵبەت پرسیشی پێناکرێ ئەوەتا حەزرەتی عائیشە (خ.ل) باوکی لە پێغەمبەر (د.خ) مارەکردووە لە حەوت ساڵانداو دیارە پرسیشی پێنەکراوە چونکە گواستیانەوە لەناو منداڵان لەسەر جۆلانە یاری دەکردو نەیدەزانی مەسەلە چییە تا دایانە دەست پێغەمبەر (د.خ) وەك لە حەدیسی پێشەوە دەگێڕێتەوەو لەوکاتەشدا کە تەمەنی عائیشە نۆ ساڵان بووەو تەمەنی پێغەمبەریش (د.خ) پەنجاو چوار ساڵ بووە. ئەو کەسانەی بەناوی دین خەڵك دەخەڵەتێنن دەبێ خوا چ سزایەکیان بدا؟ لە دونیا ڕوو زەردی و لە قیامەتیش دۆزەخ.

ئەمەیە بڕیاری فیقهی ئیسلامی لە بارەی مارەکردنی ژن و چۆنیەتی بەشوودان، ئیدی ئەو کەسانەی دەڵێن (ئایینی ئیسلام مارەکردنی بێپرس و مارەبڕینی سەر لانکە پووچەڵدەکا) نازانم لە کام ئایین و دینیان وەرگرتووە؟

# پلەی کۆمەڵایەتی ژنان

لە بارەی شایەتی و میرات و خوێن، ژن بە کەمتر لە پیاو تەماشا دەکرێ، بۆ شایەتی دووژن لە جیاتی پیاوێك دادەنرێن و لە میراتیشدا نیو بەش وەردەگرێ لە خوێنیشدا نیو ئەوەندەی خوێنی پیاو وەردەگرێ وەك لە قورئاندا هاتووە لە ئایەتی (282) لە سورەتی ئەلبەقەرەدا دەڵێ (واستشهدوا شهيدين من رجالكم فأن لم يكونا رجلين فرجل و امرأتان ممن ترضون من الشهداء ان تضل احديهما فتذكر احديهما اخرى) واتە دوو پیاو بکەن بە شایەت، ئەگەر دەست نەکەوت ئەوا پیاوێك و دوو ژن لەوانەی پێتان باشن، ئەگەر یەکێکیان لە بیری





چووەوە ئەویتر بیری بخاتەوە. لێرەدا بۆ شایەتی، ژن بە نیوەی پیاو ژمێردراوە، وەك لە میراتدا وایە سورەتی ئەلنیساء ئایەتی (12) دەڵێ (و لكم نصف ما ترك ازواجكم ان لم يكن لهن ولد فأن كان لهن ولد فلكم الربع مما تركن من بعد وصية يوصين او دين. و لهن الربع مما تركتم من بعد وصية توصون بها او دين) واتە میرات لە ژنانتان نیوەی بە جێماوەکە ئەگەر منداڵیان نەبوو، ئەگەر منداڵیان هەبوو ئەوا چواریەکی بە جێماوەکە پاش بەخشین و دانەوەی قەرز، میراتی ژنان لە مێردیان چواریەکی جێماوەکە ئەگەر منداڵتان نەبوو، ئەگەر منداڵتان هەبوون ئەوا هەشتیەك وەردەگرن پاش بەخشین و قەرزدانەوە.

ئایەتی (11) لە سورەتی ئەلنیساء دا (يوصيكم الله في اولادكم للذكر مثل حظ الأنثيين) واتە خوا لە بارەی میراتی منداڵەکانتان پێتان دەڵێ بۆ نێر دوو ئەوەندەی بەشی مێ، لە ئایەتی (176) لە هەمان سورەتدا دەڵێ (و ان كانوا اخوة رجالا و نساء فللذكر مثل حظ الانثيين يبين الله لكم ان تضلوا و الله بكل شيء عليم) واتە ئەگەر میراتگران خوشك و برا بوون ئەوا نێر دوو ئەوەندەی بەشی مێ دەبا، خوا ئاوا بۆتان دیاریدەکا نەوەکو بە هەڵە بچن، خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە ئیمامی شافیعی دەڵێ: نەمزانیوە نە لە پێش و نە تازە کەسێك لە زاناکان هەبووبێت و هەبێ ڕای لەگەڵ ئەوە نەبێ کە خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە ئەم خوێنەش بۆ ژن پەنجا حوشترە، ئەگەر بڕیاری خوێندان درا بۆ ژن ئەوە پەنجا حوشتر دەدرێ، ئەگەر ژنێك بە ئەنقەست کوژراو کەس و کاری خوێنیان داواکرد ئەوا خوێنی پەنجا حوشترە. ئەمەش دەقی قسەی ئیمام (قال الشافيعي رحمه الله تعالى: لم اعلم مخالفا من اهل العلم قديما و لا حديثا في ان دية المرأة نصف دية الرجل و ذلك خمسون من الأبل فأذا قضي في المرأة بدية فهي خمسون من الأبل، و اذا قتلت عمدا فأختار اهلها ديتها فديتها خمسون من الأبل).

## لێدانی ژن

ئایەتی (34) لە سورەتی ئەلنیساء دا دەڵێ (الرجال قوامون على النساء بما فضل الله بعضهم على بعض و بما انفقوا من اموالهم فالصالحات قانتات حافظات للغيب بما حفظ الله و اللاتي تخافون نشوزهن غعظوهن و اهجروهن في المضاجع و اضربوهن فأن اطعنكم فلا تبغوا عليهن سبيلا ان الله كان عليا كبيرا) واتە پیاو سەردارو گەورەی ژنە لەبەرئەوەی خوا پیاوی بە گەورەتر داناوە لەبەرئەوەیش کە پیاو لە ماڵی خۆیان خەرجیان داوە بە ژنان (وەك مارەیی و ناندان و جلوبەرگ کردن بۆ ژنی تەڵاق دراو) و مارەیی. بە زاوی دەڵی بە گەورە دانانی پیاو لەبەر تەواوی هۆش و بیرو ڕێك پێکی بەڕێوەبردنی کاروبار پتر هێز لە کارکردن و خواپەرستی هەر لەبەر گەورەیی پیاوە کە خوا پێغەمبەرایەتی و پێشەوایی سەرداری کارو جێبەجێکردنی کارو فەرمانی خەڵك و شایەتی و خەباتکردن (جیهاد) نوێژی هەینی و بەشی زۆری میرات تەنهایی بە جیابوونەوە لە ژن (تەڵاقدان) بە پیاوی سپاردووە و لەسەر شانی داناوە (ژنی خۆش ڕەفتاریش ئەوەیە کە خواپەرست بێ و لە خواترس بێ و بە گوێی مێردی بکاو بە پێویستی ژن و مێردایەتی هەستێ و پاشملەی مێردی پارێزگاری لە لەشی خۆی و ماڵی مێردی بکا) پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی (چاکترین ژن ئەو ژنەیە کە تەماشای بکەی دڵخۆش بێ ئەگەر کارێکی پێ بڵێی جێبەجێی بکاو ئەگەر پشتت تێ کرد بتپارێزێ لە خۆی و ماڵت) ئەوجار پێغەمبەر ئەم ئایەتەی خوێندەوە (ئەو ژنانەی بە گوێتان ناکەن ئامۆژگاریان بکەن و لە گەڵیان مەنون و لێیان بدەن ئەگەر بە گوێیان کردن بە هانایان پێمەگرن و ستەمیان لێمەکەن).

بەیزاوی دەڵی هۆی هاتنی ئەم ئایەتە دەڵێن سەعدی کوڕی ئەلرەبیع کە یەکێك بووە لە گەورەپیاوانی ئەنصاری ژنەکەی (حەبیبە) کچی (زەید)ی کوڕی (ئەبو زوهەیر) بووەو نافەرمانی کردووە ئەویش زللەیەکی لێداوە، باوکی ژنە ژنەکەی هەڵگرتووەو چووەتە لای پێغەمبەر (د.خ) پێغەمبەریش گوتوویەتی: با تۆڵەی لێ بەسنرێتەوە. پاشان ئەم ئایەتە هاتە نوسین و پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی: ئێمە شتێکمان ویست و خوا شتێکی تر ئەوەی خوا ویستوویەتی چاکترە. کەوابوو ژن وەك كرێ گرتەی پیاو دەبێ بە فەرمان بێ و هەرکاتێك نافەرمانی کرد ئامۆژگاری دەکرێ ئینجا لەگەڵی نانوێ ئەگەر هەر نافەرمانی کرد لێی دەدرێ، ئەمەش وەك دیمان، نەسی ئایەتی قورئانە. دەی ئەو یەکسانی ژن و پیاوە لە کوێیە؟! و ئەوە ڕوانگە

پیاو سەردارو گەورەی ژنە، لەبەر ئەوەی خوا پیاوی بە گەورەتر داناوە لەبەرئەوەیش کە پیاو لە ماڵی خۆیان خەرجیان داوە بە ژنان (وەك مارەیی و ناندان و جلوبەرگ کردن بۆ ژنی تەڵاق دراو) و مارەیی

هاونەوعییە لە کوێیە؟! ئا ئەمەیە حوکمی ئیسلام و لەسەر هەموو موسوڵمانێك پێویستە پێی ڕازی بێ‌و بە فەرمان بێ‌و بە دڵخۆشییەوە پەیڕەو جێبەجێ بکات.

## جلوبەرگی ژن و ژن خۆی شەرمە (عەورەتە)

بە پێی دینی ئیسلام پێویستە ژن خۆی داپۆشێ‌و جوانی خۆی‌و لەشی لەبەرچاوی پیاوی بیانی (نامەحرەم) وەدەرنەخا، واتە لەشی ژن لە خودی خۆیدا شەرمە (عەورەتە) ئەم قسەی (هەستە وەرە عەبات فریدە چ وەعدەی شەرمە) بانگەوازێکە دژ بە ئایینی ئیسلامە فەرموون با لێی بکۆڵینەوە، ئایەتی (31) لە سورەتی ئەلنووردا دەڵێ (وقل للمؤمنات يغضضن من ابصارهن و يحفضن فروجهن و لايبدين زينتهن الا ما ظهر منها و ليضربن بخمرهن على جيوبهن و لايبدين زينتهن الا لبعولتهن او آباء بعولتهن او ابناء بعولتهن او اخوانهن او بني اخوانهن او بني اخواتهن او نسائهن او آباء بعولتهن او ابناء بعولتهن او اخوانهن او بني اخوانهن او بني اخواتهن او نسائهن او ماملكت ايمانهن او التابعين غير اولي الأربعة من الرجال او الطفل الذين لم يظهروا على عورات النساء و لايضربن بأرجلهن ليعلم ما يخفين من زينتهن و توبوا الى الله جميعا ايه المؤمنون لعلكم تفلحون) واتە ئەی پێغەمبەر بە ژنانی موسوڵمان بڵێ با چاوی خۆیان دانەوێنن لە تەماشاکردنی ئەو پیاوانەی نامەحرەمن هەروەها با لەش و دامەنی خۆیان بپارێزن لە خراپەکاری و داوێن پیسی، جوانی لەشولاری و جوانی خشڵ و بەرگیان بۆ بێگانە بەدەرنەخەن تەنها ئەو شوێنانە نەبێ کە ناچارن وەدەری بخەن (وەك دەموچاو هەردوو دەست بە ئەندازەی ناولەپ واتە تا مەچەك، چونکە داپۆشینی ئەم شوێنانە ئاسان نییە) هەروەها با مل و گەردنیان بە لەچك داپۆشن و جوانی خۆیان بۆ بیانی وەدەرنەخەن تەنها بۆ مێردیان وەدەری بخەن (چونکە مێرد پێویستی بە جوانی ژنی هەیە) دیسان ئەگەر جوانیان لەبەرچاوی باوکی مێردیان و کوڕی مێردیان یان برایان یان کوڕی برایان یان کوڕی خوشکیان یان ژنانی موسوڵمان یان کارەکەریان یان دەست و پێوەندی پیر کە توانای پیاوەتیان نەمابێ‌و یان منداڵانی وەها کە هێشتا بە سەروکاری ژن و مێردایەتی نازانیت بەدەرخەن گوناح نییە هیچی جوانیان نابێ لەبەرچاوی ناموسوڵمان و کافر، چونکە لەوانەیە ژنە کافرەکان بۆ مێردەکانیان بگێڕنەوە) ژنانێك کە خۆیان بە چارۆکە دادەپۆشن و جوانیان دەشارنەوە نابێ پێی خۆیان توند لە زەوی بدەن تاوەکو خرنگەی پاوانەیان بێ‌و بەمە ئەوەی شاراوەتەوە لە جوانی بەدەری بخەن و بە خەڵکی ڕاگەیەنن کە پاوانەیان لەپێیە (چونکە لایەکتان بگەڕێنەوە پاشگەزببنەوە لەوەی پێشتر کردوتانەو چیتر ئەو کارو ڕەفتارە خراپانە مەکەن فەرمانی خوا جێبەجێ بکەن.

لێرەدا ژنی موسوڵمان نە تەنها لەبەرچاوی بێگانە دەبێ خۆی بە چارۆکە داپۆشێ، بەڵکو دەبێ لەبەرچاوی ژنانی کافریش خۆ داپۆشێ. ئیدی ئەم عەبا فریدانی ئازادی ژن لە کام ئایین هاتووە؟!

ئایەتی (60) لە سورەتی ئەلنوردا دەڵێ (و القواعد من النساء التي لايرجون نكاحا فليس عليهن جناح ان يضعن ثيابهن غير متبرجات بزينة و ان يستعففن خير لهن و الله سميع عليم) واتە ئەو ژنانەی لە سك چوونەتەوەو عوزرشۆر نین و ئومێدی مێرد کردنیان نەماوە لە خۆ گەڕاونەتەوە گوناحیان ناگاتێ ئەگەر چارۆکەیان لابەن و فڕێی بدەن، بەبێ بە دەرخستنی جوانی لەشی خۆیان، بەڵام ئەگەر چارۆکەش فڕێنەدەن و هەر لە بەریاندا بێ بۆیان باشترە (ئەم دوو ئایەتە بەڵگەی زۆر بە هێزو ئاشکران، کە نابێ ژن هیچ جێگایەکی لەشی خۆی یا جلی جوانی‌و خشڵی لە ملوانکەو گوارەو لاشەرەو پشتێنەو قۆیتاس پلپلەو کەمەرەو خەناوکەو پاوانەو گۆبەرەو بەرمورو شتی لەم بابەتانە دەربخەن و دەبێ بە چارۆکە داپۆشن بە تایبەت ئەو شوێنانەی نیشە بزوێنن وەك پوزو مەمك و سمت و ڕان و کە بە جلی تەسك لەبەرکردن دەردەکەون، پێش هاتنی ئەم ئایەتانە ژنانی پێش ئیسلام بێ چارۆکە بوون‌و هەرچی لە بەریان بووە لە خشڵ و کەلوپەلی بە نرخ هەروەها سنگ و مەمکیان، قورئان ئەم ڕەفتارەی قەدەغەکرد لە ژنی برواداری موسوڵمان وناوی ئەم ڕەفتارانەی ناوە (ڕەفتاری تاریکی‌و نەزانی) یا وەك زاراوەی ئەمڕۆی خۆمان

بە پێی دینی ئیسلام پێویستە ژن خۆی داپۆشێ‌و جوانی خۆی‌و لەشی لەبەرچاوی پیاوی بیانی (نامەحرەم) وەدەرنەخا، واتە لەشی ژن لە خودی خۆیدا شەرمە (عەورەتە)



ئەوانە بە ناوی ئایین بانگی ژنان دەکەن کە چارۆکەیان فڕێدەن و دەست لە دەستی پیاو بنێن بۆ بنیادنانی کۆمەڵێکی پێشکەوتوو و پڕ لە خۆشیو شادی، ئەمانە دژ بە ئایەت دەوەستن هەرچەند خۆیان بە پیاوی ئایین ناس و دۆست و نوێکەرەوەی دین بزانن

(کۆنەپەرستی و ڕەجعی) کەواتە ئەوانە بە ناوی ئایین بانگی ژنان دەکەن کە چارۆکەیان فڕێدەن چ وەعدەی شەرمەو دەست لە دەستی پیاو بنێن بۆ بنیادنانی کۆمەڵێکی پێشکەوتوو و پڕ لە خۆشیو شادی، ئەمانە دژ بە ئایەت دەوەستن هەرچەند خۆیان بە پیاوی ئایین ناس و دۆست و نوێکەرەوەی دین بزانن ئەوەش بزانن هیچ دینێك نوێ و کۆنی تێدا نیەو ئەوەی ئەوانە بە پێشکەوتنی دەزانن وەك ئەوەی ژنانی خوێندەوار دەیکەن وەك لەبەرکردنی تەنورەی تەسك (مینی ژوپ) و پنتۆڵی تەسك و نیوەی مەمك بەدەرخستنو یان کراسی وا تەنك لەبەرکردن کە مەمکیان بی مەمکەوانە لەبن کراسیان بەدیدەکرێ، ئەمانەو پتریش لەمانە پێشکەوتن نییە، چونکە ژنەکانی پێش ئیسلام لەمانە پتر خۆیان خەریك کردووە وەك کوتاڵێکی جوان خۆیان پیشانی خەڵك داوە هەروەك خواردنەوەی کحول و قومارکردن و چاوچڵێسی پێشکەوتن نییە ئەمانە زۆر لەمێژەو پێش ئیسلامیش هەبوون وەك ئارەزوویەك لە مرۆڤدا هەبووە، بەڵکو پێشکەوتن لە ڕەفتارو ڕەوشت و زانست و پیشەسازیو قسەو گوفتارو کردارو لەبیرکردنەوەدایە، کە بە داخەوە ئێمەی ڕۆژهەڵاتی هەر ڕەفتاری گەوجییەکەمان بێ پێشکەوتنەو لە دوای دەڕۆین کە وەك عەرەبەکانی پێش ئیسلام پێیان وابوو کە لە مێردیو پیاوەتی مرۆڤ ئەوەیە کە (کەم خۆری زۆر پەڕ بێ) کە بە عەرەبییەکەی دەڵێن (الرجولة في قلة الطعام و كثرة الوقاع) بەم پێوانە بێ چۆلەکە هاوتا نییە لە هەموو جیهاندا لە کەڵە مێردیو پیاوەتی چونکە کەس وەك ئەو کەمخۆر نییەو کەسیش هەندەی ئەو زۆر پەڕ نییە. بەڵام جێی داخە ئێستاش مێشکەکە هەر ئەو ڕستەی تێدایەو ڕەفتاریشی پێدەکرێ!! ڕاستە ئەویش پێویستە وەك خواردن و خواردنەوە بەڵام نابێ سەرمەشقی بیرو فەلسەفەمان بێ.

ئایەتی (28) لە سورەتی ئەلئەحزابدا دەڵێ (یا ایها النبي قل لأزواجك ان كنتن تردن الحيوة الدنيا و زينتها فتعالين امتعكن و اسرحكن سراحا جميلا) واتە ئەی پێغەمبەر بە ژنانت بڵێ ئەگەر جوانیو خۆشی دنیاتان گەرەکە وەرن با جلوبەرگتان بۆ بکەم و بەرەڵاتان بکەم بە خۆشیو ریکی. هۆی هاتنی ئەم ئایەتە دەڵێن ژنەکانی پێغەمبەر (د.خ) جلی باش و نانی پترو باشتریان لە پێغەمبەر (د.خ) خواست و ئەم ئایەتە هاتە خوارێو پێغەمبەر لە عائیشەوە دەستیپێکرد، ئەویش مانەوەی لای پێغەمبەرو ڕەزامەندی خوای هەلبژارد پاشان ژنەکانی پێغەمبەر پاشگەز بوونەوە لە خواستەکانیان، ئەمە وا دەردەخا ئەگەر ژن شتێکی خواست و مێرد لە دەستی نەدەهات و نەیبوو ژنەش سووربوو لەسەر خواستەکەی مێرد سەرپشکی دەداتێ بۆ ئەوەی ئەگەر بمێنێتەوە بێ جێبەجێی خواستەکانی با تەلاق وەرگرێ.

مێرد حالی چۆن بوو جۆری ژیانی پێویستە لەسەر ژن کە بە ئەندازە حاڵی مێردی بەو پێیە ڕەفتار بکا، پێغەمبەر (د.خ) کەوای کردبێ پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانان ڕەفتار بکەن چونکە پێغەمبەر (د.خ) پێشەواو پێشڕەوی موسوڵمانانەو دەبێ موسوڵمان هەموو ڕێبازی پێغەمبەر بگرێ وەك لە ئایەتی (21) لە سورەتی ئەلئەحزابدا دەڵێ (لقد كان لكم في رسول الله اسوة حسنة لمن كان يرجوا الله و اليوم الآخر) واتە بە ڕاستی پێغەمبەری خودا (د.خ پێشڕەوێکی چاکە بۆ کەسێکی خواپەرست و بڕوادار بە ڕۆژی دوایی.

یانی هەر کەسێك بیەو وای لێ ڕازی بێو ڕۆژی دوایی بۆ خۆی دابین بکا، کە لەسەر ڕێ و شوێنی پێغەمبەر بڕواو چاو لەو بکاو ڕەفتارو کردارەکانی پێغەمبەر (د.خ) جێبەجێ بکا، ئەم ئایەتە بەڵگەیە بۆ موسوڵمانان و ڕێگەیەو پێویستە لەسەری بڕۆن، دیارە مەبەست ئەو کردارو ڕەفتارانەیە کە پلەی ڕاستی وەرگرتووە لە لایەن موسوڵمانان چونکە هەر ڕەفتارێك و کردارێك و گوفتارێك گێردرابێتەوە لە پێغەمبەر (د.خ) و نەگونجێ لەگەڵ ئەحکامەکانی قورئان ڕەت دەکرێتەوەو ڕەفتاری پێ ناکرێ بە کردەوەو قسەی پێغەمبەر (د.خ) ناژمێردرێ، چونکە هەر ئایەتێکی تری قورئان لە سورەتی ئەلقەلەمدا دەڵێ (و ان لعى خلق عظيم) واتە بە ڕاستی ئەتۆ ئەی پێغەمبەر خاوەن ڕەوشتێکی بەرزو گەورەی.

ئایەتی (33) لە سورەتی ئەلئەحزابدا دەڵێ (و قرن في بيوتكن و لا تبرجن تبرج الجاهلية الأولى) واتە ئەی ژنانی پێغەمبەر لە ماڵی خۆتان ئۆقرە بگرن و مەچنە دەرەوەو کە چوونە دەرەوەش فیز لێمەدەن و بەناز مەڕۆن وەك نازو خۆپیشاندانی ژنانی سەردەمی نەزانی‌و گەوجی پێشوو. لێرەشدا ئایەت ڕێ پیشاندەری ژنانی موسوڵمانە کە وەك ژنانی پێغەمبەر ڕەفتاربکەن و نەچنە دەرەوەی ماڵ بشچن دەبێ خۆداپۆشن و جوانی خۆیان دەرنەخەن.

ئایەتی (53) لە هەمان سورەتدا دەڵێ (و اذا سألتموهن فسألوهن من وراء حجاب ذلك اطهر لقلوبكم وقلوبهن. وما كان لكم ان تؤذوا رسول الله ولا ان تنكحوا ازواجه من بعده ابدا ذلكم كان عند الله عظيما) واتە ئەگەر شتێکتان لە ژنانی پێغەمبەر خواست لە پشت پەردەوە لێیان بخوازن ئەمە پاکترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش تا گەردی لێنەنیشێ و دووریشە لە دڵپیسی، هەرگیز نابێ ئێوە ئازاری پێغەمبەر بدەن و نابێ لە پاش خۆی ژنەکانی مارەبکەنەوە، کردنی ئەم کارانە لای خوا زۆر گران و گەورەیە. ئەم ئایەتە فەرمانە بە ژن ك لەبەرچاوی پیاوی نامەحرەم خۆی داپۆشێ. دەگێڕنەوە ئیمامی عومەر (خ.ل) بە پێغەمبەری گوت: خۆشەویست چاك و خراپ هاتووچۆی ماڵتان دەکەن، ئەگەر فەرمانت بدابایە دایکی موسوڵمان خۆیان داپۆشن کە بێگانەکان دەچنە ماڵ. پاش ئەم داخوازییەی ئیمامی عومەر ئەم ئایەتە هاتەخوارێ.

دیسان دەگێڕنەوەو دەڵێن جارێکیان پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵەکانی لە ماڵی خۆیان نانیان دەخوارد دەستی پیاوێکیان بە دەستی عائیشە کەوت و پێغەمبەریش ئەمەی دی‌و زۆری پێناخۆش بو، ئەم ئایەتەی خۆداپۆشتنە هاتە خوارێ، ئەم قسەیە تەفسیری بەیزاوی دەیگێڕێتەوە. هەرچۆنێك هەیە وە هەر هۆیەك بێ بۆ هتانی ئەم ئایەتە، ئایەت ئاشکرایە کە هەر نەك هەردەبێ ژن خۆی داپۆشێ لە بەرەو ڕووی پیاوی بیانی بەڵکو دەست لەناو دەست نان وە لە تەنیشت یەکتری دانیشتن و کارکردن پێکەوە هەر نابێ.

هەرچەندە ئەم ئایەتە تایبەتە بۆ ژننای پێغەمبەر (د.خ) بەڵام چونکە پێغەمبەر پێشەواو ڕابەری موسوڵمانانە وەك نمونە تەماشا دەکرێ بە پێی ئایەت دەبێ چاوی لێبکرێ وە لە ڕێ‌و شوێنی ئەودا ڕەفتار بکرێ‌و پەیڕەوی ڕەفتارو کردارو گوفتاری پێغەمبەر بکرێ چونکە ئایەت دەڵێ (لقد كان لكم في رسول الله اسوة حسنة) هەروەها لە سورەتی ئەلجموعەدا ئایەتی (2) (هو الذي بعث في الأميين رسولا منهم يتلو عليهم آياته و يزكيهم و يعلمهم الكتاب و الحكمة و ان كانوا من قبل لفي ضلال مبين) واتە خوات ئەو کەسەیە کە لە نەخوێندەواراندا نێردراو و پێغەمبەرێکی خۆی نارد، کە ئەم نێردراوە پێغەمبەرە ئایەتی خوایان بۆ دەخوێنێتەوە وە پاکیان دەکاتەوە لە پیسی‌و بێ ئیمانی‌و نەزانی و فێری خوێندن و حیکمەتیان دەکات هەرچەندە ئەوانە لە پێشدا لە نەزانی‌و گومڕاییدا بوون. هەروەها ئایەتی (4) لە سورەتی ئەلقەلەمدا دەڵێ (و انك لعلى خلق عظيم).

بۆیە هەرکەس خۆی بە موسوڵمان بزانێ وە خواو پێغەمبەر بناسێ‌و بڕوای بە قورئان هەبێ‌و ئایەتەکان و کردارو ڕەفتارو گرفتارەکانی پێغەمبەر (د.خ) بکا، وە هەر کەسێ ئەمانە بەلاوە بنێ‌و خۆی بە پێشڕەوی چەرخ و سەردەم بزانێ وەك خۆی ئارەزوو دەکا یان وەك زروف و سەردەم دەخوازێ ڕەفتار بکا و بە مل ئیسلامیدا ببڕێ تەئویلی ئایەت و حەدیس بە ئارەزووی خۆی بکا ئەوا دوورە لە ئیسلام و شتێکی ترە. ئایەتی (59) سورەتی ئەلئەحزابدا دەڵێ (يا ايها النبي قل لأزواجك و نساء المؤمنين يدنين عليهن من جيلابيبهن ذلك ادنى ان يعرفن فلا يؤذين و كان الله غفورا رحيما) واتە ئەی پێغەمبەر بە ژننای خۆت و موسوڵمانان بڵێ با چارۆکەیان و سەرپۆشیان بە خۆدادەن، ئەمە وا دەکا کە بناسرێن و بە ژنی پاك و مەردیان بزانن تا ئازار نەدرێن لە لاین هەوەس بازان و ڕێیان پێنەگرن و گێچەڵیان پێنەکەن. تەفسیری بەزاوی دەڵێ: دەموچاو و لەشیان داپۆشن ئەگەر بۆ کارێك لە ماڵ چوونەدەرێ‌و وەدەرکەوتن، بۆ ئەوەی جیاوازیان هەبێ لەگەڵ کەنیزەك تا ئەو کەسانەی شکیان هەیە ڕێگەیان پێنەگرن و خوا لە ڕابوردووتان خۆش دەبێ.

ئایەت ئاشکرایە کە هەر نەك هەردەبێ ژن خۆی دا پۆشێ لە بەرەو ڕووی پیاوی بیانی، بەڵکو دەست لەناو دەست نان وە لە تەنیشت یەکتری دانیشتن و کارکردن پێکەوە هەر نابێ





# تێڕوانینی ژن

ژن وەك شتێکی جوان و خۆش بۆ پیاو دروستکراوە چ لە دونیا و چ لە ڕۆژی دواییدا مێینە بە شتێکی کەم تەماشا کراوە لە سەردەمی پێش ئیسلام بوونی عەرەب، وەك لەمەودوا بە ئایەت بە دیاری دەخەین، بەڵام ئایەتەکان هیچیان ئەم تێڕوانینە ڕەتناکاتەوە.

لە سورەتی ئالی عیمراندا دەڵێ (زين للناس حب الشهوات من النساء و البنين و القناطر القنطرة من الذهب و الفضة و الخيل المسومة و الأنعام و الحرث ذلك متاع الدنيا و الله عنده حسن المآب قل أنبئكم بخير من ذلك للذين اتقوا عند ربهم جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها و ازواج مطهرة و رضوان من الله) واتە لەبەر دڵی پیاوان جوان لەبارو شیرین کراوە ئارەزووی ژن و منداڵ و ماڵی زۆر لە زێڕو زیو و ئەسپی ڕاهێنراو گیانداران (وەك مانگاو مەڕو بزن و حوشتر) و کێڵگەو چاندەنی، ئەمانە هەمووی خۆشی ژیانی دونیان و خوا گەلێ لەمانە چاکتری لەلایە، ئەتۆ پێغەمبەر پێیان بڵێ: لەمانە هەمووی باشترتان پێبڵێم بۆ ئەو کەسانەی خواپەرست و پەیڕەوی فەرمانەکانی خوادەکا لای خوا بەهەشتی پان و بەرین کە بە ژێر دارو درەختەکانیدا جۆگاو ڕووبار دەڕوا، ژنی پاك و خاوێنی تێدایەو هەمیشە تێیدا دەژین و خواش لێیان ڕازییە. لەم ئایەتەدا ژن وەك مەڕوماڵات و زێڕو زیو تەماشاکراوە کە بۆ دڵخۆشی ڕازاوەتەوە. لە پێشتریش باسی ژن کراوە کە وە ك مەزاری پیاوە کە دەڵێ (نسائكم المتاع المرأة الصالحة) واتە دونیا خۆی کوتاڵو خۆشییە چاکترین کوتاڵ و خۆشی دونی ژنی چاکە.



ئایەتی (26) لە سورەتی ئال عیمران دەڵێ (فلما وضعتها قالت اني وضعتها انثى و الله اعلم بما وضعت و ليس الذكر كالأنثى) واتە ژنی عیمران کە سکی پڕبوو وە سکەکەی دانا گوتی: خوایە ئەوەی بوومە مێیە خواش بۆ خۆی چاکتر دەزانی چیم بووە نێرینەش وەکو مێینە نیە. ئەم ئایەتە دەربارەی ژنی عیمران کە دایکی مریەمەی دایکی عیسایە، دامەزرانی ئایەتەکە وا دەخوازێ کە نێر لە بەرچاوترو باشتر بووە، بۆیە ژنی عیمران بە نائومێدی وە دڵساردی ڕوو لە خوا دەکاو دەڵی خوایە خۆ ئەوە من کچم بووە خۆشت دەزانی کە کچ وەکو کوڕ نییە.

ئایەتی (72) لە سورەتی ئەلنەحل دەڵێ (و الله جعل لكم من انفسكم ازواجا و جعل لكم من ازواجكم بنين و حفدة و رزقكم من الطيبات) واتە خوا لە ڕەنگی خۆتان ژنی بۆ دروستکردن و لە ژنەکانیش کوڕو نەوە (کوڕەزا) و نانێکی باشیشی داونەتێ. لێرەدا ڕوو لە پیاو دەکاو چاکەکانی خۆی کە لەگەڵ پیاوی کردووە دەژمێرێو بیریان دەخاتەوە لەوانە دەڵێ: خوا لەبەر دڵی ئێوەی پیاو وڵسات دروستکرد کە سوودبەخشەو گەرما بەخشەو لێشیان دەخۆن هەروەها وڵاخی بەرزو کەری بۆ دروستکردوون بۆ سواریو بارو جوانیو چاندەنیتان بۆ سەوزو شین دەکاو زەیتون و خورماو ترێو میوەی هەمەچەشنەی لەبەردەست داناون ئیدی بەم جۆرە لەهەر شتە کە خوا باسی دەکا. ڕوو لە پیاو دەکا کە ئاوا بۆی دروست و ئامادەکردوون تا دەگاتە باسی ژن کە وەك لە ئایەتی ڕابردودا باسی دەکا.

ئایەتی (21) سورەتی ئەلڕووم (و من خلق لكم من انفسكم ازواجا لتسكنوا اليها و جعل بينكم مودة و رحمة) واتە لە گەورەییو نیشانەکانی خوا ئەوەیە کە لە خۆاتان ژنی بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی لە لایان ئۆقرە بگرن و لە نێوانتاندا خۆشەویستیو بەزەیی پەیدا کردووە. لێرەش ئایەت هەر ڕوو لە پیاو دەکا کە چاکەی خودا لەگەڵیدا ئەوەیە کە ژنی بۆ پیاو دروستکردووە تا لەگەڵیدا ڕابوێرێ.

ئایەتی (23) لە سورەتی (ص) دەڵێ (و عندهم قاصرات الطرف اتراب) واتە بۆ ئەو پیاوە بڕوادارانە خواپەرست و بەهەشتیانە ڕۆژی دوایی لەو بەهەشتەی کە گفتیان پێدراوە ژنی وەهایان دەدرێتێ کە چاولەدەر نین و تایبەتن بە خۆیان. ئایەتی (55) لە سورەتی ئەلدوخاندا دەڵێ (كذلك

و زوجناهم بحور عين) واتە ئەوانەی بەهەشتین ژنی جوانیان دەدرێتێ (ژنی سپیو چاوگەش) ئایەت گەلێك زۆرن لەم بابەتانەو لە هەموو شوێنێك باس باسی پیاوە، لە بەهەشت و لە دونیا هەموو چاکەیەك کە خوا کردویە لەگەڵ پیاو ئەوەیە کە ژنی بۆ ڕازاندووەتەوە لە دونیاو ڕۆژی دواییو پێشکەش بە پیاوی دەکا، بەڵام بۆ ژن خۆی هیچ باسێك نییە، ئیدی ئەو یەکسانییەی نێر و مێیە لە کوێیدایە کە ئەو نووسەرانە باسی دەکەن؟

ئایەتی (39) لە سورەتی ئەلنوردا دەڵێ (ام له البنات و لكم البنون) واتە خوا کچی هەیەو ئێوەش کوڕ. لێرەدا هەرچەندە بە پێی بیرو تێڕوانینی کۆمەڵگای عەرەبی ئەو سەردەمە دەدوێ کە کەسێ کچی هەبووایە دەبوایە خۆی بە کەم و چاوشۆڕ بزانیایە بەرامبەر بەو کەسانەی کوڕیان هەبوایە، بەڵام ئایەت لە شوێنێکی تر باسی خراپی ئەم تێڕوانینە ناکاتو ڕەتی ناکاتەوە بۆیە هەروەکو خۆی دەمێنێ. پێغەمبەر (د.خ) لە کرداروو ڕەفتارو گوفتاری کارێکی وای نەکردووە کە ئەم عادەتە شتێکیخراپە.

ئایەتی (16) لە سورەتی ئەلزوخروفدا دەڵێ (ام اتخذ مما يخلق اناثا و اصفيكم بالبنين) واتە ئایا خوا لە دەستکردی خۆی کچی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو کوڕیشی بۆ ئێوە ڕەوا بینیوە. ئایەتی (17) لە هەمان سورەت (و اذا بشر احدهم بما ضرب للرحمن ظل وجهه مسودا وهو كظيم) ئەگەر یەکێك لەوان مژدەی پێبدرایە ئەوەی بۆ خۆیان داناوە (مێ) سەروچاوی ڕەش هەڵدەگەڕاو پیشی دەخواردەوە. ئایەتی (19) لە هەمان سورەت دەڵێ (و جعلوا الملائكة الذين هم عباد الرحمن اناثا اشهدوا خلقهم ستكتب شهادتهم و يسئلون) واتە ئەو فریشتانەی خوا کە بەندەی خوان بە (مێ) یان دادەنێن ئایا ئەوان ئاگاداری دروست بوونیانن؟ ئەمەیان لەسەر دەنوسرێت و لێشیان دەپرسرێتەوە. قورئان بەوە زۆر تەنگاوە کافرەکان فریشتەی خوایان بە (مێ) ناوبردووە بەڵام خوا بە زەمیری ئیشارەیان بۆ دەکا ئەگەر (مێ) شتێکی نایابەو یەکسانە لەگەڵ نێر بۆچی وا بەم جۆرە باسی دەکا؟ دیارە (ڕا)ی دین نایەکسانی ژن و پیاوەو بە یەك چاو تەماشایان ناکات. سورەتی ئەلئیسرا ئایەتی (40) دەڵێ (أفأصفيكم ربكم بالبنين و اتخذ من الملائكة اناثا انكم لتقولون قولا عظيما) واتە ئایا خوای ئێوە ئێوەی بۆ خۆشبەخت کردوە بە کوڕو بۆ خۆیشی فریشتەی (مێ)ی هەڵبژاردووە؟ ئێوە قسەیەکی گەلێك مەزن دەبێژن، لێرەدا قسە مەزنەکە لەبەر ئەوە نییە کە خوا کەسی هەڵبژاردووە لەگەڵ خۆی کاریان پێدەسپێرێ، بەڵکو قسە گەورەکە لەبەرئەوەیە کەسی (مێ)یان بۆ خوا داناوە، خۆ ئەگەر نێریان باس بکردایە هیچ ڕەخنەیەك نەدەبوو، چونکە ئەو تا بەرامبەر بەو (مێ)یە نێریان بۆ خۆ هەڵبژاردووە. ئایەتی (57،58،59) لە سورەت ئەلنەحلدا دەڵێ (و يجعلون لله البنات سبحانه و لهم ما يشتهون و اذا بشر احدهم بالأنثى ظل وجهه مسودا وهو كظيم. يتوارى من القوم من سوء ما بشر به ايمسكه على هون ام يدسه في التراب الا ساء ما يحكمون) واتە کچ بۆ خوا دادەنێن کە سەروی ئەم قسانەیە بۆ خۆشیان چی ئارەزوو بکەن (خوزاعەو کینانە لە نەتەوەی عارەب دەیانگوت فریشتە کچی خودان) ئەگەر یەکێك لەوان ئاگادار بکرایە بەوەی (مێینەی) بووە دەموچاوی ڕەش هەڵدەگەڕاو پیشی دەخواردەوەو خۆی لە خەڵك دەشاردەوە لەبەرئەوە مژدە ناخۆشەو پیسەو نەیدەزانی چی بکا! بەسەرشۆڕیەوە بیهێڵێتەوە یان زیندەبەچاڵی بکاو لێی ڕزگاربێ، ئەو گوتەیان کە کچ بۆ خودا دادەنێن و کوڕیش بۆ خۆیان، یا ئەو قسە کە منداڵ بۆ خوا دادەنێن، خراپترین و ناشرین ترین گوفتارە.

لەم چەند ئایەتانە دەرکەوت کە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان نێرو مێداو لە قورئاندا لە هیچ شوێنێك ئەم قسانەی ڕەدنەکردووەتەوە بەوە کە بڵێ (نێرو مێ وەك یەکن) بە پێچەوانەوە لە تەلاقو مارەیی و بەشە میرات و شایەتی بە نیوەی پیاوی داناون و سەرداریش پیاو، بۆیە بە پێی ئایینی ئیسلام یەکسانی لە نێوان ژن و پیاودا نییە، هەرچەندە هەندێك چیرۆکنووس و نووسەر دەڵێن یەکسانن و بە ناوی ئایینی ئیسلامیشەوە، بەڵام دیارە ئەوان هەڵەن و ڕاست ناکەن و بەو هەموو ئایەت و حەدیسە بۆمان ڕوونبووەوە. جا با هەندێ کردارو گوفتاری پێغەمبەر بگێڕینەوە دەربارەی ژن (حدثنا هشام بن ابي عبدالله عن ابن الزبير عن جابر ان رسول الله (ص) رأى امرأة فأتى

لەم چەند ئایەتانە دەرکەوت کە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان نێرو مێداو لە قورئاندا لە هیچ شوێنێك ئەم قسانە ڕەدنەکراوەتەوە، بەوە کە بڵێ (نێرو مێ وەك یەکن)، بە پێچەوانەوە لە تەلاق و مارەیی و بەشە میرات و شایەتی بە نیوەی پیاوی داناون و سەرداریش پیاوە





امرأته زینب و هی تمعس منیئة فقضی حاجته ثم خرج الی اصحابه فقال (ان المرأة تقبل في صورة شیطان و تدبر في صورة شیطان فأذا أبصر احدکم فلیأت أهله فأن ذلك یرد ما في نفسه)..) واتە پێغەمبەر (د.خ) چاوی بە ژنێك کەوت و هەستا چووە لای زەینەبەی ژنی کە پێستەی چاك دەکردو ئارەزووی خۆی لێدامرکاندو هاتەوە لای هاوەڵەکانی گوتی (ژن بەوێنەی شەیتان ڕووت تێدەکاو بە وێنەی شەیتان پشتت تێدەکا، ئەگەر یەکێك ژنی دیت و بەردڵی کەوت و حەزی چووە سەری با بچێتەوە لای ژنی خۆی‌و بەمە دڵی دادەکەوێ‌و ئارەزووی دادەمرکێ. لە ڕیوایەتێکی تردا دەڵی (عن ابن زبیر قال جابر سمعت النبي (ص) یقول اذا احدکم اعجبته امرأة فوقعت في قلبه فلیعمد الی امرأته فلیواقعها فأن ذلك یرد ما في نفسه)..) واتە ئەگەر یەکێك لە ئێوە ژنێکی جوانی دی‌و چووە دڵیەوە با بچێتەوە لای ژنی خۆی‌و لەگەڵیدا بنوێ‌و ئەوەی لە دڵیایەتی لای دەبا. لێرەدا دەردەکەوێ کە ژن هەر بۆ ڕابواردنەو قسەیەك لە ئارەزووی ژندا نییە ئەنجا پێغەمبەر (د.خ) ژنی بە شەیتان ناوبردووە لەبەر ئەوە چونکە نەشەی پیاو دەجوڵێنێ هەتا لە ڕووی نێرو مێیایەتیش هیچ قسەیەك بۆ ژنان نییە ئەگەر ژنە حەزیشی لێنەبێ پیاو هەرپێی ڕادەبوێرێ‌و کەڵکی لێوەردەگرێ لە ڕووی مێخوازییەوە وەك لە حەدیسی موسلیمدا جزمی یەکەم لاپەڕە (166)دا دەڵێ (عن عائشة قالت کن احدانا اذا کان حائضا امرها رسول الله (ص) فتأتزر بأزار ثم یباشرها) وە حەدیسێکی تر لە مەیمونە ژنی پێغەمبەر ڕیوایەت دەکرێ دەڵێ (عن میمونة قالت کان رسول الله (ص) یباشر نساءه فوق الأذار و هن حیض) واتە هەردو حەدیس بە یەك واتایە عائیشە دەڵی ئەگەر یەکێك لە ئێمە (ژنانی پێغەمبەر) لە بێنوێژیدا بایە پێغەمبەر فەرمانی پێدەکرد کە پاچە پەڕۆیەك لە شوێنەکەدا دابنێ‌و ئەنجا دەستی پێدەکرد. مەیمونەش دەگێڕێتەوەو دەڵی پێغەمبەر (د.خ) دەچووە لای ژنی خۆی بەڵام پارچە پەڕۆیان دادەنا ئەگەر ژنەکان لە بێنوێژیدا بونایە. بێنوێژی (حەیز) حەدیسی تر بەم واتایە زۆرن لەم دوو حەدیسەش وا دەردەکەوێ کە تەنها ئارەزووی پیاو مەبەستە جێبەجێ ببێ دەنا ژنی بێنوێژ ئازار دەبینێ‌و حەزی لێناکا بەڵام هیچ ڕێگەیەك بۆ ژنان نییە تەنها بەرفەرمانی پیاوو هەرکاتێ نافەرمانیان لێ ڕوویدا بەپێی دەستووری ئیسلام ئامۆژگاری دەکرێن ئەنجا لەگەڵ نوستن ئەنجا لێدانیان.

ئیتر ئەم پیاهەڵگوتنی یەکسانییەی ئەو نوسەرو چیرۆکنووسانە دەڵێین لە کوێیەو بەڵگەیان دەبێ چی بێ؟

## پاشەکی

بەوەی لە پێشەوە باسمانکرد لە قورئان و کردارو ڕەفتارو گوفتاری پێغەمبەر هاوەڵەکانی پێغەمبەرو (ڕا)و قسەی مەزهەبی ئیمامی شافیعی بۆمان ڕوونبووەوە کە ژن یەکسان نییە لەگەڵ پیاو لە مافداو پیاو سەرداری ژنەو لە ژن گەورەترەو خوا ژنی بۆ هەوەس و ئارەزووی پیاو دروستکردووەو تەڵاق و مارەیی بەدەس پیاوەو باوك دەتوانێ کچی سەرلانکە بە شووبداو مارەی بکاو کچی خۆناس و عازەبیش بەبێ پرس بە مێرد بداو مارەی بکا.

پیاو دەتوانێ چوار ژنی هەبێ پێکەوەو لە یەك کاتداو وێڕای ئەو چوار ژنەش چەندی دەتوانێ کەنیزەکی هەبن و لەگەڵیاندا ڕابوێرێ، بەڵام ژن ناتوانێ کۆیلە بکرێ‌و لە گەڵیدا ڕابوێرێ وێڕای یەك مێرد، ئەگەر مافی ژن و پیاو وەك ئەو نووسەرو چیرۆکنوسانە دەڵێن یەکسان و وەکو یەك بوونایە دەبوو ژنیش بتوانێ وێڕای چوار مێرد پێکەوەو لە یەك کاتدا چەندی بتوانێ کۆیلەش بکرێ بۆ ئەوەی لە گەڵیاندا ڕابوێرێ‌و کەیف بکا، وەك پیاو بۆی هەیە وێڕای چوار ژن چەند بتوانێ کەنیزەك بکرێ‌و لە گەڵیاندا ڕابوێرێ‌و کەیف بکا. ئەوجار وەك پیاو دەتوانێ ئەو چوار ژنانە یەك یەك تەڵاق بداو هی تر مارە بکا یا هەر چوار بە یەکەوە تەڵاق بداو چواری تر مارە بکا چەند لە دەستی دێ‌و دارایی هەیە، ئەگەر ماف یەکسان دەبوو ژنیش بتوانێ بۆ هەوەسی خۆی مێردی تەڵاق بداو مێردی تر مارە بکاو بێنێ.

ئەمە دیارە لە ئیسلامدا شتی وەها نییەو ئەوەی ئەو نوسەرو چیرۆکنووسانە باسی دەکەن مەگەر لە خەیاڵی خۆیاندا شتی وا هەبێ‌و بەخەو ببینن و ئیسلام سەروی ئەم قسەو ڕەفتارە ناشیرینانەیەو لە قورئان و کردارو گوفتاری پێغەمبەرو یاوەرەکانی‌و (ڕا)ی ئیمامە مەزهەبیەکان بێ‌و شەرمی لێنەکا وەك لەخۆی بگا پێشکەوتووەو ئایین هی سەدەی کۆنەپەرستییە.

دووا پرسیارم لەو مافخوازانی ژن ئەوەیە! ئایا ئەوانە ئەو مافە دەدەنە ژنەکەی خۆیان یا خوشکیان یان کچیان ئەگەر بە خۆی ڕایبوارد ئەوانیش ڕابوێرن؟! یان دەیانەوێ ژن و کچ و خوشکی خەڵکی بخەنە ناو تەڵەو تەونی جاڵجاڵۆکەی چیرۆك و نوسینیان و لەو ڕوانگەوە ڕاویان بکەن و لە ئەنجامیشدا کۆمەڵە قازو قوڵنگی دایکە حەوا گیرۆدەی بەندیخانەی ئارەزووی خۆیان بکەن!!

جا بۆ ئەوەی ئەوەیان بۆ سەربگرێ نەوەستاون بە تێڕوانینەکانی پێشکەوتنخواز بەناو بەڵکو هەوڵیشیان داوە دین و ئایینیش لەم ڕووەوە بکەنە پردی پەڕینەوەیان بۆ ئەو بەهەشتە خەیاڵییەیان.

ئیتر ئومێد دەکەم توانیبێتم تا ڕادەیەك باری ژن و پیاوی موسوڵمانم ڕوونکردبێتەوەو سوود بەخش بێ بۆ هەموولایەك ئەگەر کەموکوڕیەکیش بەرچاو بکەوی بە سوپاسەوە حەزدەکەم بخرێتە ڕوو بۆ خوێندەواران و بۆ خۆشم، سوپاس.

دووا پرسیارم لەو مافخوازانی ژن ئەوەیە! ئایا ئەوانە ئەو مافە دەدەنە ژنەکەی خۆیان یا خوشکیان یان کچیان ئەگەر بە خۆی ڕایبوارد ئەوانیش ڕابوێرن؟! یان دەیانەوێ ژن و کچ و خوشکی خەڵکی بخەنە ناو تەڵەو تەونی جاڵجاڵۆکەی چیرۆك و نوسینیان و لەو ڕوانگەوە ڕاویان بکەن و لە ئەنجامیشدا کۆمەڵە قازو قوڵنگی دایکە حەوا گیرۆدەی بەندیخانەی ئارەزووی خۆیان بکەن!!



# لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی دەقەکان‌و وشە وێکچوونی وشەکان بە ڕێنووسی کۆن‌و ئەمڕۆ لە شیعری نالی‌دا

عەبدولخاق مەعروف

لە پێشەوە هەندێکمان بۆ ساغ بۆوە کە تا چ ڕادەیێك کتێبەکەی ئەوان، کە بە سێ قۆڵی دەریان کردووە ناتەواوی‌و کەموکوڕی تێدا هەیە. کاکە حەمە هاتووە دەقەکانی کە دوکتۆر مارف نووسیویە بەرابەری پێدەکا لەگەڵ نوسخەی خۆیان، و لە مەدا کەوتۆتە هەڵە. چونکە ئەو دەقانەی خۆیان نووسیویانە لەبەر ڕوناکی ڕەسابوونی مەعنایان هەڵبژاردووە، یان چۆن لایان جوانتر بووە، یا لە دەسختەکان جۆرێکی تر بووبێ. ئەوان هەر بە ئارەزووی خۆیان گۆڕیویانەو وەك ویستوویانە نووسیویانەتەوە. لێرەدا ئێمە لێکۆڵینەوەیێك دەکەین‌و بەرابەرێك لەگەڵ هەردوو تێکست ئەوەندەی لە دەستابێ لایەنگیری بێهۆیەکی بەجێناکەین‌و لە هەمان کاتدا باسی ئەو بەیتانە ناکەین، کە کاکە حەمە بە هەڵەی داناون، کە چوکلەیێك لەسەر (ی)یێك دانراوە یا دانەنراوە یا ئەو شوێنە جێگەی فاریزەیە یا نە یا ئەو (تا) یە (با)یە ئەبێ دوور بێ، چونکە ئەویان فیعلەو ئەویتر زەرفە، بەڵکو باسی ئەو بەیتانە دەکەم، کە لە (دەق) بە وشە لە یەکدی جیاوازن. هەروەهاش لەو وشانەی کە ناون کاکە حەمە کتێبە سێ قۆڵی‌یەکەیان لە پێشەکی تا دوواییی باسی وشەئاراییی‌و بەلاغەو موحەسیناتی لەفزی دەکەن، بەڵام بەو پێیەی هەردوولا کە بە ڕێنووسی ئەمڕۆیان نووسیوەتەوە زۆر لەو مەبەستانە تێکدەداو وێکچوونی وشەکانی کە بە ڕێنووسی کۆن دەنووسرا بە ڕێنووسسی ئەمڕۆ لێکیان جیادەکاتەوەو ئەو مەبەستانەی نالی هەیبوە بەدی نایێ دەبوو هەردوو لا شیعرەکانی (نالی) یان لە سەرەتای هەر لاپەڕەیەك بنووسیبایە، ئەوجا بە ڕێنووسی تازە. بۆ دوو مەبەست: یەکێکیان ئەمەیە کە یاری بە وشەکە جێگەی خۆی بگرتایەو خوێنەریش ئەو خۆشی‌و تامەی بچێژیبایە. دووەم بۆ ئەوەی هەر کەسێکی تر بیەوێ لێبکۆڵێتەوە ئەو دەراوەی هەبوایەو ئەو مەعنای ئەوان کە ڕێنووسی‌نوێ کردوویانە بە ماڵ بەسەر خوێنەر نەدەبوە ماڵ. ئومێد دەکەم ئەگەر جارێکی تر، هەر یەکێك لەوان یا کەسێکی تر دیوانی نالی چاپ کردەوە یا چاپی کرد ئەم تێبینی‌یە ڕەچاو بکاو لە ئێستاوە سوپاس دەکرێ. ئەمەش هەندێ لەو بەیت‌و

شێوانەن کە کاکە حەمە ڕەخنەی لێگرتوون و بە هەڵەیان دەزانێ.

ل 88 لە چاپی ئێمەدا: ل 83–86. لە چاپی د. خەزنەداردا: ل 44

**تاتایی سەری تووڕەیی پڕ پێچیشی بادا**
**هەر تایێکی باریکی گوڵو نافە بە بادا**

تاتایی: ڕاستەکەی (تاتایی)یە واتە هەتا تالێکی نە تاڵ تالێ. تووڕەیی: ڕاستەکەی (توررەیی= طورەیی)یە. تایێکی ڕاستەکەی (تایەکی)یە، ئەگینا سەنگی بەیتەکە لەنگ ئەبێ. بادا ئەبێ بە (بادا) بنووسرێ چونکە (دا) کەی فیعلە وەك ئەڵێن فلانەکەس فلانە شتی دا بە با. وەك لە پێشەوە باسمانکرد، ئێمە لەوە نادوێن کە (تا)ی یەکەم لە وشەی (تاتایی) کەمی دوورتر بنووسرێ یا پێکەوە بنووسرێ هەرواش لە وشەی (بە بادا)، چونکە ئەمانە شتێکی زۆر ئاساییە تەنها ڕەنگە لە قوتابخانەکانی سەرەتایی بۆ مندالان وا بنووسرێ وەك ڕوونکردنەوەو شەرحکردن، دەنا لە زمانی تری خەڵکی ئەم شتانە کەس لێی نادوێ و هەردەبێ پێکەوەش بنووسرێ، چونکە خەڵکی خوێندەوار لەگەڵ خوێندنەوەیان و شوێنی نووسینی ئەمان لێکیان جیادەکاتەوە بە خوێندنەوەش دەریدەبڕێ ئیدی لە نووسیندا دەبێ وا بنووسرێ گوتەیەکە، هەر کاکە حەمە دەیڵێ و کەسیش گوێی پێناداو ناشبێ خەڵك دوای ئەم گوتەیە بکەوێ، چونکە ئەو هەر بۆ ڕەخنە هێناویە، وەك فەقێی حوجرە لە شتی ئاوا بێبایەخ دەگەڕێ دەنا ساغکردنەوەی (دەق)کەی لەم شتانەدایە؟. (تووڕەیی) دیارە هەڵەی چاپە، چونکە دوکتۆر لە شوێنی تردا بە (توررەیی) نووسیوە، کاکم هەر بۆ قسە زۆرکردن کە خۆیشی دەزانێ هەڵەی چاپە بەڵام هەر دەینووسێ. (تایەکی) یا تاییکی لە ڕوی عەروزییەوە هیچ ناگۆڕێ نازانم کاکە حەمە ئەمەی لە کوێ هێنا دەڵێ (ئەگینا سەنگی بەیتەکە لەنگ ئەبێ). چونکە هەردوو وشە لە ڕووی عەروزییەوە پێکهاتووە لە "سەبەبێکی خەفیف" کە "تا"یەو (وەتەدی مەجموع) کە "یێکی" یا "یەکی"یە لە عەروزدا ئەگەر وشەیێك لە دوو پیت پێکهاتبێ یەکەم حەرەکەداربێ و دووەم ساکین بێ پێی دەڵێن "سەبەبی خەفیف"




وەك وشەی با، دا، تا، ما، کا، لا، را، ئا، ها، ئیدی بەم جۆرەو هەر وشەیێکیش پێکهاتبێ لە سێ پیت، دوو پیتی یەکەم حەرەکەداربن و، سێیەم ساکین بێ پێی دەڵێن "وەتەدی مەجموع" وەك یەکی، یێکی، دەبا، دەمێ، سەما، دەکاو بەم جۆرە ئیدی چۆن ئەگینا سەنگی بەیتەکە لەنگ ئەبێ کاکە حەمە؟

بەیتی دووەم کە دەڵێ:

**گوڵ هاتە دەرێ لافی لە حوسنی بوتمان دا**
**لەرزی قەدی بەرزی لە ڕقا زولفی کە بادا**

کاکە حەمە دەڵێ: "بوتمان: ڕاستەکەی (بوتیما)یە هەم لەبەر هاوسەنگی "ما" لەگەڵ وشەکانی دوا نیوە بەیتەکانی ترو، هەم لەبەر باری موسیقای نیوە بەیتەکە خۆیشی". کاکە حەمە وەك دیمانو لە مەودوایش دەیبینین دوکتۆر تاوانبار دەکا کە وشەی کوردی دەباتەوە سەر فارسی لێرەدا خۆیانی لەبیر ئەچێ دەنا بۆ دەبێ (بوتمانی) کوردی بگەڕێتەوە سەر فارسی کە (بوتی) واتە بوت بە ئیضافە بۆ "ما"ی فارسی کە واتە ئێمە. هەموو بەڵگەیێکی ئەمەیە کە خۆیان وایان نووسیوەو هاوسەنگی لەگەڵ دوانیوە بەیتەکانی ترو باری مۆسیقای نیوە بەیتەکە، جارێ لە ڕووی عەروزییەوە ئەم گوتەی کاکە حەمە وانییە شاعیر ئازادە لەمە وشەکانی هەر نیوە بە یتە لەگەڵ یەکتری هاوسەنگ بن یا نەبن لەگەڵ پێشەوەی یا پاشەوەی و یا لەگەڵ دوا نیوە بەیتی دووەم، ئەوەی گرنگەو نابێ شاعیر خۆی لێ لادا نەیتوانیوە بڵێ لەنگ دەبێ چ بڵێ باشە: باری مۆسیقا قسەیەکی ڕەوان و جوانە لە شیعردا کێ بێ بڵێ نا وانییە چونکە گەر وای گوت دیارە کابرا گوێی مۆسیقای نییە کێ بێ ئەوەی بە خۆ ڕەواببینێ وەك "کلاوەکەی پاشا" ئەنجام هەتا ئەوەش بسەلمێنین کە بەڵێ هاوسەنگی جوانە بابێ، ئەدی هەر کاکە حەمە خۆی لە لاپەڕە (93)ی کتێبەکەی خۆی لە ڕەخنەگرتن دەڵێ "نەم: ڕاستە لەگەڵ (بەم) هاوسەنگەو ڕاستیشە بە فارسی هەر مەعنای (نم)ی کوردی ئەبەخشێ بەڵام ئاخۆ ڕاستە بۆ ئەم هاوسەنگییە ناپێویستە وشەیەکی فارسی لە جیاتی وشەیەکی کوردی بەکاربێنین؟". وەڵڵاهی هەر خۆت دەیزانی ئێمە چ بڵێین خۆت لە خۆت بپرسە ئەم دوو

گوتەیە کامیان ڕاستەو ئەمە خۆت گوتەنی (چەندی بە چەندە).

ل 89 لە چاپی ئێمەدا ل 84، لە چاپی د. خەزنەداردا ل 44:

**دەمدەم کە دەکا زاری پڕ ئازاری بە غونچە**

**بۆ دەعوەتی ماچی لەبی گۆیا دەمی نادا**

"لەبی: ڕاستەکەی (لەبە)یەو ناسکی شیعرەکەش لەوە دایەوە، ئەم جۆرە وردەکارییە مەعنایینەیان پێیان ئەڵێن (جیهانی نالی).."

جارێ با مەعناکەی ئەوانی سێ قۆڵی کە هێندە بە ناسکی دەزانیو تانە لە دوکتۆر دەدا کە گوایا دوکتۆر لە جیهانی "نالی"دا ناژیو ئەگەر بژیابا وەك ئەوان دەینووسی "لەبە" ئەوان لە لاپەڕە (84)دا دەڵێن (واتە کە یار جاروبار دەمی ئازاردەری خۆی ئەکا بە خونچەی نەپشکوتوو قوتی ئەکاتەوە بەم کردارەی وەڵامی دڵدارەکانی ئەداتەوە کە داوای ماچی لێئەکەنو ئەم بە خونچە کردنەی دەمی مەعنای ئەوەیە کە ماچی دەمی ناداو گوایە ئەڵێ وەرن ماچی لێوم بکەن. یاخود مەعنای ئەوەیە دەمی بۆ ماچکردنی لێوی بانگەواز ئەکا. دەی کامەتە ناسکییەکە هەر مەعناکە وانییەو بە سێ قۆڵی تێدا بە هەڵەچوون، چونکە ئەو کەسانەی داوای ماچی لێئەکەن بە یار دەڵێن وەرە ماچێکی لێوانمان بدەیێ، یار بەو زارەی کە هەر جار ئازاری داوون بە قسە کە "نا"ی گوتوە یا قسەی ناشیرینی پێگوتون بەم زارە پڕە ئازارە کە وێکی دەینێتەوەو کۆی دەکاتەوە دەڵێ "نا"دە مەیی ماچ نادا. لێرەدا وشەی "گویا" مانای فارسییەکەی هەیەو "گۆیا"ی کوردی نییە کە وەك ئەوان نووسیویانەو مەعناشی یان کردووە بە "گویا". مەعنا فارسییەکەشی ئەوەیە کە "دەڵێ" و ئیسمی فاعیلە وەکو "قائیلەن"ی عەرەبی. وشەی (دەمێ)ش لە (دە) و (مێ) پێکهاتووە بە پێی ئەم مەعنایەی من بۆی چوم دەبێ شیعرەکە بەم شێوە بنووسرێو بخوێندرێتەوە

**دەم دەم کە دەکا زاری پڕ ئازاری بە غونچە**

**بۆ دەعوەتی ماچی لەبی "گویا" دەمێ، نادا**

دیسان لەبەر ڕوناکی ئەو مەعنای ئەوانیش دیاریانکردووە هەردەبێ بە "لەبی" بنووسرێ چونکە (ی) کە ضەمیری کەسی سێیەمەو دەگەڕێتەوە بۆ یار نازانم کاکە حەمە چۆن دەڵێ




ناسکی شیعرەکە لە لەمەدایەکەیە "لەبە" بنووسرێ؟!

لاپەڕە 89 (سهم الف القد فقد صاد فؤادی)

**صاد هو من عینة قد صادف صادا**

سهم الف القد: لە عەرەبی شتی وا نیەو هیچ مەعنایەك نابەخشێ ڕاستەکەی سهم الف القدیمە نازانم بۆ لە عەرەبی شتیوا نییە کاکە وشەی "سهم" موزافە بۆ الف القد واتە تیری بەژن باریك یا تیرێك کە بەژن باریکە دڵمی ڕاوکردو پێکای ئەگەر بڵێن تیرێك کە بەژن باریکە ئیزافە کە بەیانی دەبێ ئیدی بۆچی ئەگەر شتێك نەزانی دەبێ لەو زمانەدا شتی وا نەبێ کە تۆ نەیزانی.

لاپەڕە 90 لە چاپی ئێمەدا: ل 79–82 لە چاپی د. خەزنەداردا ل 45

**خاکی بەری پێت هەم گڵە. هەم گوڵ بەسریشکم**

**وەختی غەمو شادی ئەو کردومە بەسەردا**

"گڵە: ڕاستەکەی (گڵو) وە بە شێوەی نووسینی کۆن (گل) و (گل) وەك یەك بە (گل) ئەنووسران (و)ی عەطفو (ی) ئیضافەش ئەوسا نەئەنووسران بەڵام (ە)ی ضەمیر ئەنووسرا نالییش جیناسەکەی نێوان (گل=گل) و (گول= گل)ی مەبەست بووە. سریشك: سریشك وشەیەکە لە فارسیدا. لە کوردیدا (سروشك)ە. وەختی! ڕاستەکەی (وەقتی)یە. نالی ئەم جۆرە وشانە بە گوێرەی ئەسڵەکەیان بەکاردێنێ" بە پێی ڕێزمانی کوردی دەبێ "گڵە" بنووسرێ چونکە تەواوکەری "خاکی بەری پێت"ە لە لایێك لە لایێکی تر لەبەر ئەوەی وشەی "هەم" کە نیشانەی عەطفە لە گەڵیاندا بەکاربراوە پێویست بە (و)ی عەطف ناکاو ئەگەر بشبێ زیادەیەو بێ سوودە، لە بەلاغەدا پێی دەڵێن (جشو) ئەوجار کە دەڵێ (و)ی عەطفو (ی)ی ئیزافە لە ڕێنووسی کۆن نەدەنووسران وانییە چونکە ڕێنووسی کۆن ڕێنووسی فارسییەو ئەویش (و) عەطف دەنووسێ بەڵام (ی) ئیزافەو سەرو بۆرو ژێر نانووسێو ئەو (ە)یەی کاکە حەمە لێرەدا بە ضەمیری تێدەگاو دەڵێ دەنووسرا ئەم (ە)یە ضەمیر نییە ئەم (ە)یانە لە عەرەبی ضەمیرن لە کوردیدا حەرفی پەیوەندە یا بڵێین وەك فیعلی مساعیدە لە ڕێزماندا وەکو وشەی "ئەست" لە فارسیداو is ئیز لە ئینگلیزیدا. وەك لە پێشەوەش باسمانکردووە سریشك کە فارسییە لە کوردیدا

(سروشك)ی پێنالێن ئەوان هەر لە خۆیانەوە ئەم وشانە لەگەڵ هەندێ دەسکاری بە کوردی دادەنێن. کاکە حەمە نالی بەوە دادەنێ کە وشە عەرەبییەکان وەك خۆی دەنووسێتەوە بەڵام وەك مەسەلەی "هاوسەنگییەکەیە" بۆ خۆیان کە پێویستیان بەوەبێ وشەکە وەك ئەسڵەکە بەکارنەبەن دەڵێن: ئەمە بووەتە کوردیو ئەو وشەی کە وەك خۆی بەکاربرابێ دەڵێن نالی وشەکان وەك ئەسڵەکە دەنووسێ بۆ نموونە: لە لاپەڕە (96)دا دەڵێ "مەئوا: ڕاستەکەی (ماوا)یە لەبەر هاوسەنگی نیوە بەیتەکانو لەبەر وشە ئاراییش" و لە لاپەڕە (182ی کتێبە ڕەخناوییەکەی خۆیدا دەڵێ: "نەما: هەرچەند وشە عەرەبییەکە "نەماء"ە بەڵام لە کوردیدا بووە بە (نوما)" دەی ئەم قسەیە چی لێهات کە دەڵێی "نالی ئەم جۆرە وشانە وەك ئەسڵەکەی خۆیان دەنووسێ".

لاپەڕە 93 لە چاپی ئێمەدا: ل 93–95 لە چاپی د. خەزنەداردا ل 47

**دل موزمەحیلی دەردە وەکوو دیدە لە نەمدا**
**لە حەیرانو پەریشانە وەکوو قەترە لە یەمدا**

"نەم: ڕاستە (نەم) لەگەڵ "یەم" هاوسەنگەو، ڕاستیشە بە فارسی هەر مەعنای "نم"ی کوردی ئەبەخشێ، بەڵام ئاخۆ ڕاستە بۆ ئەم هاوسەنگییە ناپێویستە، وشەیەکی فارسی لە جیاتیو وشەیەکی کوردی بەکاربێنین؟" ئەم گوتەیە لە خۆتان بپرسن ئەوا هەر ئەتۆنی؟ لە لاپەڕە (89) کتێبەکەت دەڵێی "بوتمان: ڕاستەکەی (بوتیما) هەم لەبەر هاوسەنگی (ما) لەگەڵ وشەکانی دووا نیوە بەیتەکانی تر" دەی بوتیما کوردییە؟ خۆتان لە دیوانە سێ قۆڵییەکە لە لاپەڕە (83) پەراوێز (2)دا دەڵێن "بوت: بت. ما: ئێمە وشەیەکی فارسییە" باشە ئەم هاوسەنگە نییە لێرە پێویستە وەك لە "نەم" و "یەم"ەکەدا ناپێویستە.

لاپەڕە 93

**(نالی)و مەسەلی خالی لە ئەشکەنجەیی غەمدا**
**وەك ناڵە لە نەیدا وەکو نالە لە قەڵەمدا**

"نالیو: ڕاستەکەی (نالی)یە بێ (و) چونکە مەبەست شوبهاندنی حالی نالییە نەك نالیو حالی". کاکە حالی هەر شتێك بێ (مەحالەکە) باس ناکرێ چونکە "حال" شتێکی سەربەخۆ نییەو ئەم حاڵە پەیوەندێکی توندی لەگەڵ زاتەکە




هەیە هەر جۆرە حالێك کاری خۆی دەکا لە زات لەبەر ئەمە ڕاستەکە ئەوەیە کە نالیو حالی بێ نەك تەنها حاڵ وەك ئێوە نووسیوتانە ڕاست نییە. بەڵام ئەوەی زۆرجار لە ڕەخنەکەی "لە پێناوی ئەدەب"دا دوپاتی دەکاتەوە ئەوەیە کە دەڵێ ئەم (و)ە زیادە دەنا شیعرەکە لاسەنگ دەبێو زۆر جاریش "و"ەکە زیادەو باسی ئەوەش ناکا کە شیعرەکە لاسەنگ دەبێ وەك بڵێی ئەم (و)ە دوو حاڵەتی هەبێ هەم وەزنی ڕیشەو هەم وەزمی دیك بۆ نموونە ئەم (و)ی کە لێرەدا هەیەو لەسەر (ڕا)ی کاکم زیادەیە وەزنی ڕیشەی هەیە هەبێو نەبێ نە لەنگ دەبێو نە مەنگ. یان کاکە حەمە گوتەنی "هەڵی بە تالان زانیوە لە بێئاگایی خەڵکی لە پێوانەی شیعر "عیلمی عەروز" وەك خۆی لە دوکتۆری گوتووە، دیارە وەك مەسەلی کوردی "کاکم گوێزان لە باری خۆی دەژمێرێ". چونکە وەك دیتمان بە بێسەرو بەرو بێ هیچ پێوانەیێك بەناو دەکەوێ بە ئارەزووی خۆی دایدەدڕێو دەنووسێ "دەنا لەنگ دەبێ" (هاوسەنگی وا دەخوازی)و ناسکی شیعرەکە لەمەدایە، وردەکارییە لێرەدایە وشەکارییەکە لەمەدایە، ئەم هاوسەنگییە ناپێویستە، ئەمە پێویست (با) کە دەبێ دووربێو "تا"کە ئەبێ نزیك نەبێ، ئەمە دەبێ وابنووسرێ ئیدی لەم بابەتانە کە لە زۆر شوێن دەقە شیعرییەکانی ئەوان لەنگن چاری کورت کردنو درێژکردنەوەی حەرفەکانی بۆ نەکرێ هەر بە لەنگی دەمێنێنو کەسیش نابی زات بکاو بڵێ ئەمە وانییەو بەسەر خەڵکی سەپاندووەو کردوویە بە ماڵ کە هەرچی کاکە حەمە بی بێژێو بیبێژێ بیچیرێ دەبی ڕازی بنو ورتەیان لە دەم نەیێتەدەرو دەست لەسەر سینگ لە خزمەت بوەستنو بڵێن "بەڵی قوربان فەرماییشتە" بۆیە وا بە ڕاشکاویو بێپەروار لەهەر شوێنە بە ئارەزووی دڵی خۆی بەراوێك شیعر لەنگ دەکاو هەر بێ ئەو واوەش لەنگی ناکا "سوحانەللا مریشکی ڕەش هێلکەی سپی دەکا" کەسیش نابێ زاتو جورئەت بکا بڵێ بۆچی وایە یان بڵێ وانییە چونکە هەرکەس وابڵێ تازە ماڵی خرابوو قوڕێکی خەستی بۆ خۆی گرتەوە، تازە نە بە ئەدیب نە بە ئەدەب دۆست دەژمێردرێو نە کوردیش دەزانێو نە زەوقی شیعری هەیە تووڕەش بێ هەر کوردیش نییە لە (کۆڕیش)

مالۆیران دەکرێ، تازە نە کتێبی بۆ چاپ دەکرێو نە پارمەتیش دەدرێ، جا کێ بێ ئەم ماڵۆیرانیەو دەردیسەرییە بە دەستی خۆی تووشی خۆی بکا؟ مەگەر نیمچە مەلاییێکی نەزانی وەك من ئەم داوەی بۆ خۆی بنێتەوە. کاتی خۆی هەندێ برادەری مندالّ ترسێنی کاکە حەمە پێیان گوتم ئەمە مەنووسەو خۆت مەخە ناو داوی کاکە حەمەوە، بەلّام من پێیانم گوت ئەو داوەی ئێوە دەیلێن لەمێژە کەوتومەتە ناوی، لەو ڕۆژەوە کورد شانازی بە (کەوچك) و (دەرخۆنە)ی داری خۆی دەکا، بۆیە پشت بە کەوچكو بە ئومێدی دەرخۆنە لەو هەرو گیڤە نەترسامو دەستم بە نووسینی کرد جا با کاکە حەمە جنێو بداو ئێمەش لێی فێری ئەم "ڕۆشنبیری نوێ"یە دەبین بە سوپاسەوە.

لاپەڕە 95 لە چاپی ئێمەدا: ل 75–78. لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا ل 48.

**نالی نیەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە**

**ئەمما هەیەتی قووەتی دلّ قودرەتی ئینشا**

(نیەتی) لێرەدا مەبەست لێی (نییەتی) واتە (نیازیەتی)یە بەلّام دوکتۆر بە نیشانەی ئەوەدا کە لە نیوە بەیتی دووەمدا نووسیویەتی (هەیەتی) دیارە وای لێ حالّی بووە لە مەعنای "نەبوون"ەوە هاتبێ، کە ئەوەش هەلّەیە. هەیەتی! ڕاستەکەی (نییەتی)یە. هونەرەکەش جگە لە ڕووی مەعناشەوە، لەو جیناسەو لە کۆکردنەوەی دوو (نیەتی)یە دایە.

لە بنەڕەتدا ئەوان خۆیان بە هەلّەداچوون، چونکە نالی لە چەند شوێنی تر باسی توانایيو قودرەتی خۆی دەکا کە دەسەلّاتێکی چاکی لە دەربڕینو شیعر هەیە وەك ئەوان دەلّێن ئەگەر نالی وای مەبەست بێ نەدەبوو جوانیش نییە شاعیرێکی وەك "نالی" خۆی بخاتە ناو دوو قسەی یەکدیگرو نەبوو شیعری وای بگوتایە کە باسی هێزو تواناو دەسەلّاتی خۆی دەکا بۆ نموونە هەر لە دیوانەکەی خۆیانی سێ قۆلّی لە ل 260دا دەلّێ

**(نالی) عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا**

**مەعنایی زۆرو گەورە بە لەفقی کەمو بچوك**

لە جێگاییێکی تردا لاپەڕە (480) دەلّێ:

**بەحری غەزەلم لە پڕ دوڕڕ گەوهەرە ئەمما**

**عەووامی دەوێ یەعنی بە تەعمیقی بزانە**

لە لاپەڕە (555)دا دەلّێ:

**(نالی) بەداوە شەعری دەقیقی خەیالّی شیعر**




**بۆ ئەو کەسەی کە شاعیرو صەد داوی نایەوە**

لە لاپەڕە (577)دا دەلّێ:

**فارس و کوردو عەرەب هەرسێم بە دەفتەر گرتووە**

**(نالی) ئەمڕۆ حاکمی سێ مولّکە دیوانی هەیە**

لە لاپەڕە (657)دا دیسان دەلّێ:

**خەلقی کە هەموو کۆدەکەن و بەستەزمانن**

**بابێن و لە (نالی) ببەن شیعری سەلیقی**

جا توخوا شاعیرێك ئەوەندە بە خۆیدا هەلّبلّێ چۆن دەلّێ ئەمما (نیەتی) قووەتی دلّ قودرەتی ئینشا ئەدی ئەو هەموو شیعرەی کە باسی خۆی دەکا هەمووی ئەوە ناگەیێنێ کە قووەتی دلّو قودرەتی ئینشای هەیە؟ بەلّام ئەوەیان زۆر جوانە کە بلّێ سیحری بەیانی نیەیە بەلّام قودرەتی ئینشای هەیەو ئەمەش گوتەییێکی زۆر واقیعییانەیە ئەوجا کۆکردنەوەی (نیەتی) و (هەیەتی) ئەوەش هونەرمەندانەیەو کەمتر نییە لە کۆکردنەوەی دوو وشەی وەك یەكو لە مەعنا جیا، بەلّکو ئەمەیان بەهێزترە.

لاپەڕە 96 لە چاپی ئێمەدا: ل 118–121 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 50

**حیرەت زەدەوادیدە وەکو حەلقەیی دەرما**

**بێپایە نیەیە عاشقی بێچارە بفەرما**

پایە: ڕاستەکەی (مایە)یە چونکە لێرەدا مەبەست شانازی کردنە بە بەهرە نەك بە پایەی کۆمەلّایەتییەوە کە لای کەسی وردبین بێ بایەخی نییە، هەرچەند لە چاپی (کوردیو مەریوانی)و چاپی (گیو موکریانی)یشدا (پایە)یە.

بەلای من ڕاستەکەی (پایە)یە چونکە (مایە) بە زۆری بۆ پارەو سەرمایە بەکاردێو ئەگەر جاربەجار بۆ کەسێك بەکاردی کە هیچی نییە پێی دەلّێن بێمایەو ئەم زاراوەیەش هەر خاوەن پارەکان بەکاریان هێناوە بۆ خەلّکی کە ویستبیان بە سوکی تەماشا بکەنو بە پێچەوانەی ئەمە (پایە) بۆ کەسێك دەگوترێ کە خاوەن بەهرەییێك بێ زۆر کەس هەیە لەناو کۆمەلّ کە خاوەن پارەو پوول نییە بەلّام بەڕێزە لای خەلّكو بە پایەدار دادەندرێ بۆ نموونە مەلاکانی کوردستان لەناو کۆمەلّدا جێگەی خۆیان کردبووەو بە پایەداربوونو ژیانیشیان لەسەر خەلّك بوو، واتە خۆیان پارەییێکیان نەبوو، هەروەها زۆر لە شاعیرەکانمان پارەیان نییەو خاوەن مولّكو زەوی نین، بەلّام لەبەر شیعرەکانیانو ئەم بەهرەیە لەناو

کۆمەڵ دیارن‌و ڕێزیان لێدەگیرێ‌و بە پایەدار دەژمێردرێن. کەسێك کە لە ناو کۆمەڵ جێگەیێکی نەبێ‌و پایەیێکی نەبێ دەبێ ئەو کەسە چ بێ کە وەکو کاکە حەمە دەڵێ (کەسێکی وردبین بێ پایەی کۆمەلایەتی بایەخی نییە) ئەدی ئەم هەوڵ‌و تەقەلای کاکم دەیدا بۆ پایە نییە ئەدی بۆچییە ئەگەر بۆ پایە نییە دیارە بۆ پارەیە ئەمەیان زۆر نالەبارە ئەگەر وابێ. کەوابوو، ڕاستەکە ئەوەیە کە دوکتۆر نووسیویە، و کە ڕێکیشە لەگەڵ چاپەکەی (کوردی‌و مەریوانی) و (گیو موکریانی) زۆر نایابە هەرچەندە کاکم زۆری پێناخۆشە بەڵام بە هەندێ نییە.

لاپەڕە 97 لە چاپی ئێمەدا ل: 124–128 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا 51–52

**گەل ئەگەر تورکی تەعال ئەر عەرەبی**

**بێ ئەگەر کوردی ئەگەر فارسی بیا**

"گەل: ڕاستەکەی "گێل"ە کەسێ "گەل" و "گێل" لە یەك نەکاتەوە چۆن ئەتوانێ بڕیاربدا غەزەلێکی تورکی هی نالی‌یە یان نە! فارسی: ڕاستەکەی (فورسی)یە لەبەر ڕاگیرکردنی نیوە بەیتەکە".

جارێ دوکتۆر بۆ خۆی تورکی دەزانێ‌و لە زۆر کەسی تورکیزانم پرسیوە دەربڕینەکە کە بە ڕێنووسی کوردی بنووسرێ ئەوەی دوکتۆر نووسیویە ڕاستە‌و ئەوەی ئەوان نووسیویانە هەڵەیە، چونکە بە حەرفی لاتینی تورکی دەنووسرێ (Gel) و لە کوردیدا (گەل) دەنووسرێ‌و خوێندنەوەکە لە نێوان سەروژێرە. ئەمە لەوێ بوەستێ ئەرێ خۆ کاکە حەمە تورکی نازانێ ئەوا نازانم چۆن وا بە ڕاشکاوی دەڵێ کەسێك "گەل" و "گێل" لەیەك نەکاتەوە.."

لە وشەی ئەگەر (فارسی) دیسان ئەوان کەوتونەتە هەڵەوە، چونکە یەکێ فارسی زمان یا لە ڕەگەزا فارسی بێ پێی دەڵێن (فارسی) نەك فورسی وەك یەکی عەرەبزمان پێی دەڵێن عەرەبی نیسبە بە زمانی عەرەب نازانم کاکە حەمەو سێ قولییەکە چۆن لێیان تێکچووەو پێیان وابووە ئەگەر بنووسن "فارسی" سەنگی بەیتەکە تێکدەچێ. کاکە سەنگەکە دڵنیابە لە شوێن خۆیەتی‌و تێکناچێ، چونکە لە عیلمی عەروز (فار) وەك (عال) لە وشەی (فارسی) و وشەی (تەعال) بە سەبەبی خەفیف دەژمێردرێن واتە پیتێکی حەرەکەدار ئەنجا ساکنێك.

لاپەڕە 98 چاپی ئێمەدا ل 97–101 لە چاپی دکتۆر خەزنەداردا ل 53:

**سەهم‌و نەسیبی ئەسلی‌یە بەحسی گیاهو گوڵ نی‌یە**

**تووتنە خەرجی سووتنە مۆدنەیە ماچی لەب دەکا**

"مۆدنەیە: ڕاستەکەی (موودنە)یە هاوسەنگیشی لەگەڵ (تووتنە)و (سووتنە) نیشانەی ئەم ڕاستییەیە".

نازانم یەکێك کە شارەزای لە زماندا نەبێ بۆ هەروا لەبەر خۆ مل لێدەنێ‌و دادەدرێ‌و ناگەڕێتەوە سەر قاموسێك، پرسیار لە خەڵك، بۆ ئەوەی تووشی هەڵەی ئاوا نەبێ هەموو کەسێکی کەمێك لە عەرووز بخوێنێتەوە وەك لە پێشەوەش باسمانکردووە هاوسەنگی لە نێوان وشەکانی نێوە بەیت پێویست نییە واتە ئەگەر ببێ‌و نەبێ لە ڕووی عەروزییەوە یەکە، بەڵام ئەگەر شاعیرێك توانی ئەوە بکا کارێکی هونەرمەندایە بەڵان نابێ بۆ ئەم کارە زمان تێکبدا وەك ئەوان لەم بەیتەدا بە سێ قۆڵ بەهەڵە کردویانە بۆ ڕاستی ئەم قسەیەم ئەمە فەرهەنگی مامۆستا تەوفیق وەهبی کە پێکەوە لەگەڵ ئەدموندز دەریانکرووە بە ناوی قاموسی کوردی ئینگلیزی لاپەڕە (93) بەم جۆرەیە.




Kurdish- English Dictionary Tawfig wahby and Admonds Oxford 1966.
P. 43

Modie- modne. n. mauth piece of pipe Cigarette Halder.

واتە (مۆدنە) ئەو پارچەیەی لای دەمە لە سبیل‌و قەننەو دار جگەرە ئیدی چۆن هاوسەنگی لەگەڵ تووتنە.. نیشانەی ئەم ڕاستییەیە؟

لاپەڕە 99 لە چاپی ئێمەدا ل 108–111 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا ل 54:

**هەرکەسێ نوقسانی ڕووی باویتە سەر ڕووی ئایینە**

**شاهیدی هەرچەندە ڕەئیولعەینە، کەی باوەڕ دەکا؟**

"نوقسانی: ڕاستەکەی بە دوو (ی)یە یەکێکی مەصدەری‌و یەکێکی ئیضافە ئایینە: ڕاستەکەی (ئاینە)یە ئەگینا نیوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ کەی: ڕاستەکەی (کێ)یەو ئەبێ بە فاعیلی فیعلی (دەکا) کە لە دوواوە دێ". بەك ەم وشەی (نوقسان) خۆی عەرەبییەو مەصدەریشە هیچ (ی) ناوێ بۆ ئەوەی بکرێ بە مەصدەر بۆیە کاکم لێرەدا خۆیان بە هەڵەچوون چونکە بە دوو (ی)یان نووسیوە دووەم

(ئايينە) ڕاستەکەیە وەك دوکتۆر نووسیویەو بەم جۆرە لە ڕووی عەروزەوە ڕاستو تەرازووە بەڵام وەك ئەوان نووسیویانە لەنگە، ئەوجاریش دێ نوسخەی خەڵکی لەبەر ئەو هەڵەی خۆیان دەیکا بە هەڵەو دەشڵێ (ڕاستەکەی ئاوايیە وەك ئێمە نووسیومانە) جێی داخە کە مرۆی ئەدەب دۆست بەم جۆرە ڕقی ئەوەندە زۆربێ ڕاستی خەڵکی ناڕاست بکا، بۆ ئەوەی وەك خۆیانی لێبێ وەك کوێرە حەز بکاو هەوڵبدا هەموو چاوساخان کوێر بکا. سێیەم "کەی" ڕاستەکەی "کێ" نییەو ئەوان کە بە "کێ"یان نووسیوە هەڵەیە، چونکە ئاشکرایە "نالی" خۆشەویستەکەی خۆی بە ئاوێنە داناوەو ئەو خەڵکەی تانە لەو یارەی دەدەن و دەڵێن خێڵو قیچەو نوقسانە ئەوا خۆیان لەناو ئاوێنەکە دەبینن بە خواری وا دەزانن ئاوێنەکە خوارە هەرچەند ئەوانە بە چاوی خۆیان خۆیان ئاوا دەبینن بەڵاك کەی باوەڕدەکا کە ئەم خۆی تێ خوارو نوسانە، ئەوەی ئەوان نووسیویانە کە "کێ" باوەڕدەکا چۆن جۆردەکرێ لەگەڵ شیعرەکە کە دەڵێ هەرکەسێك نوقسانی خۆی لە ئاوێنەدا ببینێ، خەڵکی بۆ باوەڕ ناکا؟ بەڵام کاکەی نوقسان، باوەڕناکا کە ئەوە خۆیەتی. من بۆ خۆم کە فەقی بووم دیارە کاکە حەمەش کاتی خۆی فەقێ بووەو ڕەنگە ئەوەی من دەیڵێم ئەویش ئەو حاڵەتانەی دیبێ. ئێمەی فەقێ ئاوێنەو تاقمی تەراشمان هەبو وا دەبوو خەڵکی گوند دەهاتنە لامان، جاری وا هەبوو کە تەماشای ئاوێنەی دەکرد ڕەنگی خۆی بە زەردی دەدیت دەیگوت ئەم ئاوێنە ڕەنگی تەڵخە. نەیدەگوت من ڕەنگ زەردم.

یان باوەڕی نەدەکرد کە ڕەنگی زەردە کەواتە دەبێ ئاوێنە نوقسانییەکی هەبێ. ئەمە لە لایێك لە لایێکی تر هەر ئەم شیعرەی نالی خۆی بەڵگەیێکی ترە بۆ ئەمە کە دەبێ "کەی" بێ نەك "کێ" چونکە دەڵێ.

**عەکسی چاوی تۆ لە چاویدا بە خواری تێدەگەی**
**کە چ نەزەرکەی فەرقی خواروو ژوورو خێرو شەڕ دەکا**

لاپەڕە 100 لە چاپی ئێمەدا: 101–106. لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا ل 55–56

**بلبلی تەبعم ئەوا دیسان سەنا خوانی دەکا**
**نوکتە سەنجیو بەزلەگوییو گەوهەر ئەفشانی دەکا**




"گەوهەر: هەرچەندە لە دوو نوسخەی (عەلی موقبیل) و (گیو موکریانی)دا وا نووسراوە. ڕاستەکەی هەر (عەنبەر)ە و لێرەدا مەبەست قسەی وەك عەنبەر بۆنخۆشە". بەڵێ گوڵی بۆنخۆشو تووتی بۆندارو بۆنخۆشو دارو شەمامەی بۆنخۆش لە کوردیدا گوتراوەو بیستراوەو کورد بەکاریدێنێ بەڵام قسەی بۆنخۆش وەك سڵاوی بۆندارە کێ بیستویە بڵێن فلانە شاعیر یا فەیلەسوف یا زانا یا هونەرمەند قسەکانی بۆن خۆشن، یان عەنبەرن شتی وانییە، بەڵام دەگوترێ قسەکانی گەوهەرن ئەویشی لەبەر بەنرخی یا دەڵێن گەوهەر دەبارێنێ یا هەر قسەیێکی دوڕو گەوهەرێکە ئەمە بۆ پیاو بۆ ژنانیش ئەگەر قسە خۆشبێو قسەکانی بەنرخ بن دەڵێن شەکرو نەباتی لە دەم دەبارێ. لەبەرئەمە "عەنبەر" هەڵەیەو "گەوهەر" ڕاستەو تانەش لە دوو نوسخەکەی (عەلی موقبیل) و "گیو موکریانی" جوان نییە بۆتان، چونکە ئێوە نیوەی دیوانەکەتان لەبەر نوسخەی عەلی موقبیلو گیو موکریانی نووسیوەتەوە وەك لە پێشەوە ئیسپاتمان کردووە ئیدی ئەم بێپەروایییە لە پای چی؟

لاپەڕە 103 لە چاپی ئێمەدا ل 148–152 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا ل 59–60

**چ شیرینە خوتووتی دەوری لێووت**
**بەلی مەعلوومە خۆشە خەتتی یاقووت**

"لێووت: ڕاستەکەی (لێوت)ە ئەو (و)ی دووەمی بۆچییە". پیاو نازانێ چۆن قسە لەگەڵ ئەم برادەرە بکا، لە سەرەتاو بنەتای کتێبەکەی خۆیان باس باسی عەروزو سەنگو تەرازوو ڕێزمانو وشە ئارايیە کەچی لێرەدا دەڵێ ئەم دو (و)ەی وشەی "لێووت" بۆچییە" دیارە نازانێ، با من بۆت بڵێم یەکەم ئەگەر ئەم (و)ەی تر نەبێ شیعرەکە لەنگ دەبێو حەزیشم دەکرد کاکە تێمبگەیێنێ ئەم تەنها (و)ە قورپەسەرە چۆن دانی پیادەندرێ کە کەوتۆتە نێوان دوو (ساکین) ئایا خۆی بەسەرکردۆتەوە کە دەتوانێ دەنگی ئەم (و)ەی لە "لێوت"دایە دەربێنێ بەبێ حەرەکە پێدانی (ت)کە لە دوولا بەدەر نییە: یان دەبێ بەرەکەی بدەین بە (ت)ی دوواوە یان بنلێو بخرێ، یان دەبێ حەرەکەیێك بدرێ بە (و)ەکە دیاریشە حەرەکە دەبێ لە جیسنی خوێ بێ ئەم پێوانەیە

که هەر یەکێك لەواوو یێ ئەگەر کەوتنە نێوان دوو حەرفی بێ حەرەکە دەبێ حەرەکەیان بدرێتیێو لە جینسی خۆشیان بێ واتە ئەگەر (و) بوو واوێکی تری لەگەڵ دەنووسرێو ئەگەر (ی) بوو ئەوا (ی)کی تری لەگەڵ دەنووسرێ، وەکو (چاووت) و (ناووت) و "خاووت" و (ڕاووت) و (مێووت)، مێوو. هەرکاتێش حەرەکە درا بە پیتی دووا پیت ئەو زیادەیە دەڕوا چ (و) بێو چ (ی) وەك بلێی ئەمە (مێوژە) یا ئەمە (ناوتە) ئەمڕۆ نۆرە (روتە) هەروەهاش لە پیتی (ی) وەکو زایینن مایین، بوییت، چوییتو لە کاتی دەنگدانی دوا پیتی زیادەکە دەڕوا وەکو مەرەکان زاینە ماینێکم کڕێ، (چویتە بازاڕ)، (بویتە مامۆستا) ئیدی نازانم کاکە هەروابێ تویشە چۆن دێتە ئەم بازاڕەوە؟

سەیریشە ئەم (و)انە بە زیادە دادەنێو ناشڵێ دەنا لەنگ دەبێ دیارە ئەم جارەش ئەم (و)ە لە وەزنی ڕیشەیە.

ل 103 لە چاپی ئێمەدا: ل 152–154 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 60.

**خرخالی قەدەم وەك خەمی زولفەینی سەراپات**

**پشتانی قەدت بیت فیدای بازنی بازووت**

"خرخالی: ڕاستە وشەکە لە کوردیدا "خرخاڵ"ە بەڵام لە ئەسڵدا (خلخال– خڵخاڵ)ەو لە هیچ کام لە نوسخەکانی بەردەستی ئێمەدا بە (خرخاڵ) نەنووسراوەو دوکتۆر مارفیش لە پەراوێزەوە ئیشارەتی بۆ نوسخەیەکی تر نەکردووە نووسیبێتی (خرخال)." سوبحانەللا ئەوان ئەوەندە بە پەرۆشەوەی نوسخەکانن‌و وشەییێك یا پیتێك بگرە حەرەکەییێك زیادو کەم ناکەن ئەگەر لە نوسخەییێکی بەردەستیاندا نەبێ. تکا لە خوێنەری بەڕێز دەکەم بگەڕێتەوە سەر ئەو لاپەڕانەی نووسیومانە لە بارەی گوێنەدانی ئەوان بە نوسخەکانی بەردەستیان کە پتر لە بیست جێگا دەڵێن لە هیچ نوسخەکانی بەردەستمانا وا نەنوسرابوو ئێمە پێمان هەڵەبوو، بۆیە گۆڕیمان ئەوجار نازانم دیارە کاکە حەمە ئەو دیوانەی خۆیان چاپیان کردووە نەخوێندۆتەوە دەنا چۆن دەیگوت لە هیچ نوسخەیەکی بەردەستیان نەنووسراوە (خڕخاڵ) ئەدی ئەمە چییە هەر لە شیعرێکی تری نالی نووسیوتانە:

**صەوتی تنەغمەی بولبولە یا چەهچەهەی خرخالیە**

**دەنگی سولە یا لە ژێر پێی ناڵە ناڵی ناڵیە!**








لە پەراوێزیشدا مەعنای خرخالتان بە بازنگ لێداوەتەوە کە ئەمەش وانییە.

لاپەڕە 104 لە چاپی ئێمەدا: ل 170–174. لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 62

**ئەم لەسەر تەعزیمو گەورەگرتنی ئەو بێ قسوور**

**ئەو لەسەر تەحقیرو تەخفیفو شکەستی ژارە مار**

(ژارەمار: ڕاستەکەی زاری مار)ە وەك ئێمە نووسیومانە هەرچەندە لە نوسخە چاپییە پشت پێبەستراوەکانی دوکتۆرا نووسراوە "ژارەمار"). خوێنەری بەڕێز مەسەلی کوردی دەڵێ "گەر بە هیچت شەرم نەبوو هەرچی دەڵێی بڵێ" ئێستا یەکێك کە ئەم دێڕانەی کاکە حەمە دەخوێنێتەوە وا تێدەگا کە زۆربەی دەسنووسەکانی ئەوان (زاریمار)یان نووسیوە، تەنها چاپەکەی (عەلی موقبیل) و (گیو موکریانی) نووسیویانە (ژارەمار) کە بێبایەخن لای کاکە حەمە بەم قسانەش کاکە حەمە بۆڕی ماکیافیللی داوە تکایە فەرموون جارێکی تر قسەکانی کاکە حەمە بخوێننەوە پاشان وەرن ئەوەی ئەوان کە بە سێ قۆڵی نووسیویانە لە لاپەڕە (172) پەراوێز (2( بخوێنینەوەو هەرکەس لەبەر خۆتانەوە (ڕا)کەتان دەربڕن.

(لاپەڕە (172) پەراوێز (2) (زاری مار: هەموو نوسخەکانی بەردەستمان "غم" و "گم" و (مز) نەبێ: ژاریمار. (عم) و (گم) و "مز" ئارەمار. وەك وتمان، لە هەموو نوسخەکانی بەردەستمانا "ژار" نووسراوە ئێمە لامان وابوو ئەمە هەڵەیەو ڕاستەکەی "زاری مار"ە. بۆیە گۆڕیمان‌و کردمان بە "زاری مار"). جا توخوا کاکە حەمە وەکو من گوتم وانییەو؟ کێ بێ وا بێپەروا بڵێ (هەرچەندە لە نوسخە چاپییە پشت پێبەستراوەکانی دوکتۆردا نووسراوە (ژارەمار)). کە بشزانێ لە هەموو دەسخەتو دەستنووس‌و چاپەکان بە کورتی لەهەر نۆزدە سەرچاوە جێ متمانەکەی کاکە حەمەو سێ قۆڵییەکەو لە نێوانیاندا دوو دەستنووسەکەی مەلای زاناو پایە بڵندو شارەزاو نالی زانی کە س چل ساڵەی ئەم دواییە کوردستان بە خۆی نەدیوە هەموو تێکڕا نووسیویانە "ژار" ئەوجا ئێوە پێتان هەڵە بووەو هاتوون هەموو تێکڕا نووسیویانە "ژار" ئەوجا ئێوە پێتان هەڵە بووەو هاتوون ئەو نائەمینییەشتان کردووەو تێکستان گۆڕیوەو

سەرەڕای ئەمەش تانە لە دوکتۆر مارف دەدەیو دەتەوێ ئەویش شوێن پێی نائەمینی ئێوە بکەوێ؟ توخوا هیچ ماکیافیلییێك وای کردووە؟

لاپەرە 105 لە چاپی ئێمەدا: ل 221–223 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا 63.

**خاووبێ خاوی دوو زولفی خاووم ئەز**

**چاوە چاوی یەك غەزالەی چاووم ئەز**

(خاووم: هەروەها (چاووم) ئەبێ یەکی بە یەك (و) بنووسرێن دوکتۆر وشەی پێشی دووا وشەی هەموو بەیتەکانی ئەم غەزەلەی بە هەڵە بە دوو (و) نووسیوە، غەزالەی ڕاستەکەی (غەزالە)یە. غەزالە لە چاو ئەوەیە کە چاوی وەك چاوی ئاسك وابێ).

هەڵە ئەوەیە کە ئێوە تێی کەوتوون، کە (خاوم) و (چاوم) بە یەك واوتان نووسیوە چونکە لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد کە (و) و (ی) ئەگەر کەوتنە نێوان دوو پیتی بێدەنگ دەبێ دەنگیان بدرێتێ لە جنسی خۆیان، دەنا یەك لە دووان (و) (ی)یان حەرفی پاشەوەیان دەرناکەوێ یا خۆیان دەرناکەون‌و ژێر لێو ئەخرێن. بەرامبەر بە غەزالەی کە نووسیویەو دەڵێ: ڕاستەکەی بەبێ (ی)یەو ناشڵێ لەنگ دەبێ لە ڕاستیدا ئەگەر ئەم (ی)یە هەڵگیرێ نیوە بەیتەکە لەنگ دەبێ، بەڵام ئەوکاتە دەبێ حەرەکەی (ل)ەکە درێژ بکرێتەوە جا بۆ ئەوەی ئەوە نەکرێ‌و لە نوسخەشدا بە (ی) نووسراوەو لە هەمان کاتدا غەزالەی: بۆ ئەوە دەبێ کە (غەزالی) بێ‌و مەعانەکەش وەك (غەزالە چاوە) وایە بۆیە هەروەکو دوکتۆر نووسیویە لام ڕاست ترە.

لاپەرە 106 لە چاپی ئێمەدا: ل 224– 227 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 64

**بن زك‌و جەبهەت سپی کلك بۆر دامەن سیاه**

**یەککەناس‌و سی‌برو دوبادو شەش دانگ‌و درێژ**

(کلك بۆ: ڕاستەکەی (کلك‌و سەر)ە. کلك بۆ وەك مەعنایەکی بەکەڵك نابەخشێ، نیوە بەیتەکەش لەنگ دەکا).

دەبوو کاکە حەمە کە لاپەرەی کتێبە سێ قۆڵییەکەی خۆیانی نیشان داوە وەك لەوێ نووسراوە ڕاستیکاتەوە، کەچی لێرەدا واینەکردووە، ڕەنگە بەم دووابیە تێگەیشتبێ کە لە پێوانەی عەروزی دووبارەکردنەوەی وشەیێك لە پاش کەمتر لە حەوت بەیت شتێکی جوان نییە




بۆ شاعیرو، کەم توانایی شاعیر بەسەر وشەی زمانی دەردەخا، بۆیە هاتووە لە تێکستی کتێبەکەی خۆیانی لاداوەو کردوویە بە (کلك‌و سەر) کە لەکتێبەکەی ئەوان نووسراوە (کلك ئیستر) و لە بەیتی سێیەمیشدا دیسان دەڵێ (کلك ئیستر) لە باسی کەرێكدا دووجار پێی بڵێ کلك ئیستر نازانم چ توانایێك چ جوانییێك هەیەو ئەوان چۆن ئەو تێکستەیان هەڵبژاردووە، هیچ نەبا دەبوو لە دوکتۆر بپرسن تا بزانن مەعنای (بۆ) چییە یا لە یەکی تر وەك مامۆستا زەبیحییان بپرسیبایە ئێستا وەك ئەوان نووسیویانە نیوە بەیتەکە بە تەواوی لەنگەو لە هی شاعیر ناچێ.

جا ئەو هەموو زەحمەتەیان کێشاوەو وشەیان گۆڕیوەو دەستکورتی زمانیان خستۆتە پاڵ (نالی) هەر لەبەر ئەوەی مەعنای (بۆ)یان نەزانیوە، چونکە وەك خۆشیان دەڵێن دەبێ هەر وشەیێك ئەوان نەیزانن حەمە گوتن (دەبێ بە ناچاری هەڵەبێ) دەنا نابێ کوردی بێ‌و کاکەمان تێی نەگاو نەیزانێ، یان نەیبیستبێ بەڵام دیارە بە هەڵە چون، چونکە (کلك‌و بۆ) مەعنایەکی بە کەڵك دەبەخشێ پێچەوانەی قسەی کاکە حەمە کە دەڵێ (وەك مەعنایەکی بەکەڵك نابەخشێ) (بۆ–بۆی) وشەیێکی کوردییە بەو موانەی سەر ملی گوێدرێژو ئەسپ‌و ماین‌و ئێستر.. دەگوترێ‌و لە شێوەی سولەیمانی‌و بە فارسی (یال)ی پێدەڵێن ئەمەش (قاموسی زمانی کوردی بەرگی دووەم "ب" نووسینی مامۆستا عبدالرحمن محمد امین زەبیحی چاپخانەی کۆڕی زانیاری کوردی بەغدا 1979 لاپەرە (90) دەڵێ: (بۆ: یاڵی ئەسپ‌و ماین) ئەوجار کێ بیستوویە لەناو کوردەواری باسی جوانی وڵاخ بکرێ بەسەر ڕەش یا (سور) یا (سپی) یا (زەرد)، لە ناوچەی دزەیی‌و موکریان (سەر سوور) و (سەر ڕەش) بۆ مەڕو بەرخ بەکاردەبرێ، واش دەبێ بۆ پیاوان بەکاردەبرێ وەك فلانە کەسی سەر سپی یا سەر سوور.

نیوە بەیتەکەش ئەگەر بە لەنگ دێتە بەرچاو ڕەنگە هەڵەی چاپی بێ کە (و)ێکی لە نێوان (کلك) و (بۆ) پەڕاندووە بۆیە نیوە بەیتی یەکەم بەم جۆرە دەبێ:

**بن زگ‌و جەبهەت سپی کلك‌و بۆر دامەن سیاه**

ل 107 لە چاپی ئێمەدا: ل 155– 156. لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 67

**خانەیی دڵ کە خەراپە چ بڵێم**

**بە خەیاڵت کە بفەرموو بە عەبەس**

(خەراپە: ڕاستەکەی (خەراجە)یە واتە کاولە).

کاکە حەمە لە زۆر شوێنی تر ڕەخنە لە دوکتۆر دەگرێ کە گۆیا وشە کوردییەکان، یان بووە بە کوردییەکان دەگەڕێنێتەوە سەر فارسی، بەڵام لە خۆیان ناپرسێ کە چ هەوڵێکیان داوە کە وشە کوردییەکان یان بووە بە کوردییەکان ببەنەوە سەر عەرەبی، یان فارسی، بەم گوتەیە کە هێشتا تەواو سوور نەبووەتەوەو نەبووە بە کوردی ئەگەر وانییە چ کوردێکو لە چ شوێنێك بە (خەراپ- خراپ) دەڵی (خەراب-خراب) کورد دەڵێ "کوڕە ماڵ خراپ" واتە ماڵ کاوول یا وێران هەروا خراپ بەرامبەر "چاك"یشە ئەوە فەرهەنگی مامۆستا تەوفیق وەهبی لاپەڕە

a. and A dv. Xirap (A) bad spoilt. badly excessivly p. 158

واتە خراپ وشەیەکی عەرەبییە لە ئەسڵدا وەك سیفەتو زەرفیش هاتووە بەواتە بەد. کاول. بەدی. سەخت) هەروەها لە زۆر شێوەی کوردی وشەی (خراپ) بێدەنگدانی (خ) هاتووە وەك لە فەرهەنگی ناوبراودا نووسراوە. ئیدی دەبێ لەبەرچی بێ کە کاکە حەمە دەڵێ (ڕاستەکەی (خەرابە)یە).

ل 107 لە چاپی ئێمەدا: ل 137–241 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 67–68

**ئەی دڵ خەراجی حاسیلی زولمەتی بەحرو بەر**

**میراتی ئیعتبارە لە فرزەندی فەیلەقووس**

(زوڵمەتی: ڕاستەکەی (زوڵماتی ظولماتی)یە ئەگینا نیوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ). بۆ ئەوەی چیتر نەچینەوە سەر باسی ئەوەی کە بڵێین دەبێ وابنووسرێ دەنا لەنگ دەبێ، لێرەدا هەندێ پێوانەی عەروزی دەخەمە بەرچاو، بۆ ئەوەی خوێنەران تێبگەن، پێوانە عەروزییەکە لە نووسینەوەی شیعرەکەیە وەك شیعر، یا لە نووسینەوەی شیعری (نالی) چ لە دیوانی (نالی) دوکتۆرو دیوانەکانی ترو چ لە دیوانە سێ قۆڵییەکەی خۆیان نووسینەوەی عەروزی مەبەست نییە، بەڵکو وەك شیعر نووسراوەتەوە ئەمەش هەندێ لەم پێوانە عەروزیانە کە لە "علم العروض و القافیة" وەرگیراوەو نووسینی کتێبەکەش لە لایەن "الدکتور عبدالعزیز عتیق استاذ بجامعه بیروت العربیة" نووسراوە لە ساڵی 1974دا چاپکراوە لە لایەن (دار النهضة العربیة للطباعة و النشر بیروت لاپەڕە (13).




**4–نووسینی عەروزی:**

لە پێشەوە باسی ئەوەمان کرد، کە پەیوەنێکی زۆر لە نێوان شیعرو مۆسیقادا هەیە، ئەم پەیوەندییەش پەیوەندی لقە لەگەڵ ئەسل. لە ڕاستیدا عەروز جۆرێکە لە مۆسیقاو بووە بە پێوانەو بنەوانی شیعر. ئەگەر مۆسیقا هەندی ڕەمزی نووسینی هەیە کە بەم ڕەمزانە ئاوازەکانی جۆراوجۆری دەزاندرێ، ئاواش عەروز ڕەمزی تایبەتی نووسینی هەیە کە لەگەڵ ڕێنووسی ئاسایی یەکدیگرنابن چونکە نووسینی شیعرەکە بە ڕێنووسی ئاسایێ دەبێ، و نووسینی شیعر بە شێوەی عەروزی تایبەتییە. ئەو ڕەمزانەش تەفاعیلەکانی عەروزی پێدەزاندرێ وەك ئاوازەکانی مۆسیقای جۆراوجۆر.

ئەنجا نووسینی عەروزی لەسەر دوو بنچینەیە:

1–ئەوەی دەنگدانەوە "تەلەفوز دەکرێ" دەنووسرێ

2–ئەوەی بێدەنگە "تەلەفوز ناکرێ" نانووسرێ.

ئەمەش لە نوسینەوەی عەروزی پێویست بەوە دەکا کە هەندێ پیت زیاد بکرێ، کە بە ڕێنووس نانووسرێنو هەندێ پیتیش لابرێ، کە بە ڕێنووس دەنوسرێن ئەمەش ئەم حەرفانەن کە پتر دەکرێن.

1–ئەگەر پیتەکە گیراو بێ بە دوو پیت دەنووسرێ وەك (موسوەدە) دەنووسرێ (موسوەدە)

2–ئەگەر پیتەکە تەنوینی لەسەر بوو، تەنونیەکە بە نوون دەنووسرێ وەك (جَبَلٌ) دەنووسرێ (جەبەلون).

3–لە هەندێ ئامرازی نیشانە ئەلفێك زیاد دەکرێ وەك (هذا) بە نووسینی عەروزی دەنووسرێ (هذا) هەروەها لە وشەی (الله) و (لکن) بە نووسینی عەروزی دەنووسرێن (ئەللا) و (لاکن)

4–واوێك زیاد دەکرێ لە هەندێ ناو وەك لە (داود، طاوس) بە نووسینی عەروزی دەنووسرێ (داوود، طاووس)

5–حەرەکەی پیتی کێش (قافیە) بە حەرفێك دەنووسرێ کە لە ڕەنگی خۆی بی ئەگەر بۆر بوو

بە (و) دەنووسرێ‌و ئەگەر ژێر بوو بە (ی) دەنووسرێ ئەگەریش سەر بوو ئەوا بە ئەلف دەنووسرێ.

6-ئەگەر حەرەکەی (ە)ی ضەمیری نێری نادیاری تاک، درێژکرایەوە بە پیتێکی لە ڕەنگی حەرەکە دەنووسرێ بۆیە ئەو بۆرەی لەسەر (ە)یە لە (لە) و (منە)و (عنە) بە نووسینی عەروزی دەنووسرێ (لەهو) و (مینهو) و (عەنهو) هەر وا حەرەکەی (ژێر) لەسەر "ە"ی "بە، الیە، فیە" ئەگەر درێژکرانەوە بە نووسینی عەروزی دەنووسرێن (بیهی، ئیلەیهی، فیهی).

ئەو پیتانەی لادەبرێن لە نووسینی عەروزی:

1-هەمزەی وەصل ئەویش ئەو ئەلفەیە کە دەتواندرێ بە هۆی ئەو دەنگ بدرێتە بێدەنگێک کە لە پێشی پیتی دەنگدار هەبێ، ئەمانەش دەبێ لە:

کرداری ڕابردووی پێنج وشەشە پیتی دەستپێکراو بە هەمزەن هەروەها لە کرداری ئەمرەکانیان‌و لە چاوگەکانیشیان وەك انطلق، استغفر، لە کرداری ڕابردوو انطلق، استغفر لە کرداری ئەمر انطلاق، استغفار) لە چاوگە ئەمانە لە نووسینی عەروزی ئەگەر لە پێشیان پیتی دەنگدار هەبوو ئەم ئەلفە لادەبرێ وەکو (فەنطەلەقە) و (فەستەغفەرە) لە ڕابردوو و (فەستەغفیر، فەنطەلیق لە ئەمرو فەنطلاق فاستغفار لە چاوگەودا).

ئیدی بەم جۆرە تا دوایی، واتە هەر کاتێ کەسێك ویستی بزانێ ئەو شیعرە بە پێی عەروزە یان نەء بەم شێوەیەی دەنووسیۆتەوە کە باسکرا بەڵام وەکی تر، نە پیت لائەبرێ‌و نە پیت زیاد دەکرێ ڕێنووسی چۆنە وا دەنووسرێتەوە ئیتر کاکە حەمە بەسەرمان دەکاتە ماڵ کە نووسینەوەی شیعری نالی لە دیوانی نالیی دوکتۆر مارفدا دەبێ بەوپێیە بێ ڕاست نییەو لەگەڵ عیلمی عەروز یەکدیگر نابن‌و قسەکە بێپێوانەیەو نابێ کەس بەم ڕێگەیەدا بڕوا، ئەوان کە لە هەندێ شوێن وایانکردووە ڕاست نییە، ئەوجار لە عەروزدا تەفعیلەی دوایی نیوە بەیتی یەکەم پێی دەڵێن (عەروز)و تەفعیلەی دوایی نیوە بەیتی دووەم پێی دەڵێن (زەرب) تەفعیلەکانی تر پێیان بڵێین (حەشو) هەر بەحرە ڕێو شوێن‌و پێوانەیێکی تایبەتی هەیە، بۆ




گۆڕینی یەك لەم سێیانەو هەر گۆڕینێك بەو پێوانانەی باسکراوە لە عیلمی عەروز ئەگەر بکرێ هیچ ناتەواوییێك بە شیعرەکە ناداو ناشگوترێ لەنگە ئەو کەسەی دەیەوێ ئیتر ئەمە لە عەروز بزانێ ئەوا کتێبەکە لە بازاڕ هەیەو ئاسانیشە، پێم وایە هەموو کەسێك دەتوانێ بەشی خۆی لێهەڵێنجێ بە نیسبەت شیعرێ کە بە پێی عەروز گوترابێ.

ئەوجا کاکە حەمە کە دەڵێ (زولمەتی: ڕاستەکەی (ظولماتی)یە ئەگینا نیوە بەتیەکە لەنگ ئەبێ). ڕاست نییە چونکە ئەوەی ئەوان نووسیویانە (ظولمات) کۆی (زولمەت)ە واش نانووسرێ دەبێ بنووسرێ (ظولومات) یا (طولەمات) کە ئاواش بنووسرێ دیسان شیعرەکە لەنگ دەبێ. ئێمە لە خوێندنەوەی شیعرەکە، کە ئەگەر (زولمەتی) بنووسرێ کەمێك (سەری "م"ەکە درێژتر دەکەینەوەو بەم جۆرە لەنگ نابێ ئەمە لەوێ بوەستێ، نازانم چۆنە کاکە حەمە لە "فرزەندی" نەینووسیوە "ڕاستەکەی (فورزەندە)یەو ئەوەی دکتۆر نووسیویە نە فارسی وای دەڵێن‌و نە کورد، فارسییەکەی (فرزەند)ەو بە کوردیش "فورزەند"ە) دەبێ کاکم لەمەدا "ڕا"ی چۆن بێ کە ئەوان "فورزەند"یان نووسیوە کە نە کورد وای بەکاردێنێ‌و نە فارس، ڕەنگە ئەمە شێوەی زمانی دەوری شارەزووربێ؟!

لاپەرە 107 لە چاپی ئێمەدا: ل 248-251 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 68-69

**شیرنییەو لە تاڵی‌و ترشی خەلاسە ڕووت**
**خالت لەسەر جەبین بووەتە دانەیی سماق**

(شیرینییەو: ڕاستەکەی (شیرین یو)وە. نالی‌و: ڕاستەکەی (تالی‌یو)ە خەلاسە: ڕاستەکەی (عیتابی)یە ئەگینا نیوەی دووەمی بەیتەکە مەبەست نادا بە دەستەوە). بە پێچەوانەی کاکە حەمە ئەوەی ئەوان نووسیویانە لە دیوانە سێ قۆڵییەکەی خۆیان زۆر نابەجێیە، چونکە عیتاب لە ڕوودا نابێ یانی چی (عیتابی ڕوو)؟ ئەوان وایان نوسیوەو مەعنایان کردووە

**شیرینی‌یو، لە تاڵی‌یو ترشی عیتابی ڕووت**
**خاڵت لەسەر جەبین بووەتە دانەیی سماق**

(واتە ئازیزەکەم! تۆ لە خۆتدا شیرینی، بەڵام بە هۆی ئەو هەموو گلەیی‌و بناشتە تاڵ‌و ترشەوە کە ئەیکەیت‌و بە ڕووتەوە دەرئەکەوێ‌و ڕووتی

پێ گرژ بووە، خاڵەکەی بە ناوچاویشتەوەیە وەك دەنکی ترشە سماق دێتە پێشچاو) جارێ دانە سماق ناحەزە؟) نالی وابڵێ ئەوەی دوکتۆر نووسیویە لەمە باشترە کە دەڵێ: شیرینی‌و جوانییە لەتۆ کە ڕووت تاڵی‌و ترشی پێوە نەماوەو ئەو هەموو تاڵی‌و ترشییە پێشان کۆبوەتەوە لە خاڵی نێوچاوانت وەك دەنکە سماقی لێهاتووە کە ئەوەندەی تر خۆشیکردووە. بەڵام ئەوەی کە نوسخەکەی (چن) و (ت) و (من) و "عب" و (اح) نووسراوە بەلای من گەلێ جوانترە لە هەردوو دەق هەر ئەوان نووسیویانە (عەتابی) لە جیاتی (خەلاسە) و (عیتابی) و شیعرەکە بەم جۆرە دەبێ.

**شیرینی‌یە لە تاڵی‌و ترشی عەتابی ڕووت**

**خاڵت لەسەر جەبین بووەتە دانەیی سماق**

خۆی شتێك ئەگەر دروستبکرێ بە نیسبەت لە تاڵی‌و ترشی‌و شیرینی شتێکی زۆر مەزەداری لێدەردەچێ مەعناکەش وایلێدێتەوە شیرینەو جوانە کە لە تاڵی‌و ترشی‌و شیرینی ڕووت خولاسەی کردوە لە خاڵت لە نێوچاوان وەك دەنکە سماقە کە ئەم خاڵە ئەبینم هەموو خۆشی‌و ناخۆشیەکانم بیردەکەوێتەوە بە یەکخۆشی هەستپێدەکەن کە لە بن نایە.

ل 107 لە چاپی ئێمەدا: ل 251–254 چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 69

**سەراپای گرتوی زولفەینی خاووت**

**موسەلسەل هەم موخەلخەل هەم موتەووەق**

(زولفەینی خاوت: ڕاستەکەی (زولفت بۆیە بویی)یە بەپێی ئەوەی دوکتۆر نووسیو یە نیوە بەیتی دووەم هیچ مەعنایەك نادا بەدەستەوە).

لە سەرەتاوە بنەتای هەردوو کتێبەکانیان دیوانە سێقۆڵییەکەو کتێبە ڕەخناوییەکە باس هەر باسی ڕەوانبێژی‌و مەجازو ئیستیعارەو وشەئارایی‌و جیناسە، و زۆر دڵتەنگیشە بەوەی کە دوکتۆر نووسیویەو دەڵێ ئەمانە بە هەموو مەلایێك دەرچووی کۆلیژی ئەدەبیات دەکرێ، ئەوانیش لە چەند شوێن دەڵێن نە بە هەموو مەرییێك دەکرێ‌و نە بە دەرچوی کۆلیژی ئەدەبیات‌و چەند جاریش توانجیان لە دوکتۆر داوە، کە دەرچووی کۆلێژی ئەدەبیاتەو نەشیتوانیوە ئەمە جێبەجی بکا لایەنی ڕەوانبێژی یان زۆر بە گرنگ گرتووە هەرچەندە بە داخەوە دەڵێم خۆشیان تێدا سەرنەکەوتوون، چونکە وەك لە پێشەکی کتێبە سێقۆڵییەکەیاندا باسکردووە، لە دەقەکانی شیعری (نالی) خۆیان لە تەشبیەو ئیستیعارە بە هەموو چەشنییەوە نەگەیاندووە، تەنها وشەکان نەبێ کە جیناسە یا ضیاق‌و تەناسوب لەم بابەتانە کە ئەمانە هەموویان بە یەك تەعریف کردنیان بەس بوو، بۆ ئەو خوێنەرەی شارەزای ئەم ڕێبازە نەبی‌و بۆ خۆی دەیانی دۆزییەوەو خۆشیشی پتر دەبوو و پێویست بەم هەموو خەرج‌و ماندووبوونەش نەبوو و کتێبەکەش ئەوەندە زۆر نەدەبوو هەرزانتریش دەکەوتە دەستی خوێندەواران. یان ڕەنگە ئێستاش وا تێبگەن کەنرخی شت بە قەبەییە؟




جا پاش ئەم هەموو پێداهەڵگوتنە هاتوون تووشی هەڵەیەکی ڕەوانبێژی زەق بوون‌و بەسەریان تێپەڕیوەو نیوە بەیتێکیان گۆڕیوە بۆ ئەوەی مەعنا بە دەستەوە بدا، تۆ بڵێی کاکە حەمە گوتەنی (دەرکی پێنەکردبێ)؟ دیارە کاکم‌و ئەوان وا تێگەیشتوون، کە نالی وشەکانی بە ئیسمی مەفعول ڕیزکردوون چۆنیش دەبێ زولف بووبێتە جێی پاوانەو دەورەداربێ، لە کاتێکدا زوڵف خۆی بووەتە پاوانەو تەوق لە ملی یاردا، بۆیە هاتوون گۆڕیویانەو کردوویانە بە سەراپای گرتووی زوڵف بۆیە بویی) ئەرێ برا ئەوە نەدەکرا وەك سەدان مەجازی تر بتانفەرمووبایە "نالی" لێرەدا مەجازی لوغەوی بەکارهێناوە، لە وشەی "موخەلخەل" و (موتەووەق) بە پەیوەندییەك کە ئیشتیقاقەو ئیسمە مەفعول لە جێ ئیسمی فاعیل بەکاربراوەو وشەی (موسەلسەل)یش هەر خۆی مانای لولە، ئیدی ئەم هەموو زەحمەتییەشی نەدەویست. سەرباری ئەمانەش مەعنای (موخەلخەل)یان بە هەڵە لێداوەتەوە کە دەڵێن (موخەلخەل: پێبەزنجیر" لە کاتێکدا (موخەلخەل) مانای جێی پاوانەیە وەك لە ئەلمونجیددا لاپەڕە (190)دا دەڵێ (المخلخل موضع الخلخال من الساق) ڕەنگە ئەگەر دوکتۆر وەکو ئەوانی بنووسیبایەو ئەوانیش وەك دوکتۆر، و ئەم ڕەوانبێژییەیان ڕەچاوبکردایە، کاکە حەمە بەردەبووە گیانی دوکتۆر: کە بزانە چۆن دەرکی پێناکەی؟ وەك دەیان جاری تر کاکە وایکردووە.

سەرئەنجام نیوە بەیتەکە بەو شیعرەی ئەوان نووسیویانە کە ناحەزەو لەنگیشە، با بگەڕێینەوە سەر پێوانەکانی عەروزی گەر باوەڕناکەن.

ل 108 لە چاپی ئێمەدا: ل 255– 260 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 70

**دەستی چناری ڕووت سەری شاخۆ کێوو کەل**

**ڕازانەوە بە خیلعەتی دیباوو بەرگ و تووك**

(کێووکەل:: ڕاستەکەی (لێوی گوڵ)ە وەك ئێمە نووسیومانە ئەگینا، سەرەڕای ناسکی مەعنای (لێوی گوڵ)، ئەبێ کۆکردنەوەی (شاخ) و (کێو) و (کەل) کە هەموو یەك واتا ئەبەخشن، چ سوودێکی تیابێ!). بە داخەوە موشکیلەی ئەم برادەرانە ئەمەیە ئەگەر مەعانییێکیان بۆ نەسازا دێن شیعەرکە دەگۆڕن بە پێی ئەو مەعنایەی بۆیان دەسازێ، دەنا لە دەستپێکردنی "نالی" بەم شیعرە کە دەڵێ..

**سوفی وەرە با بچینە زوهراتی باغ و راغ**

**لایێ هەمو شکوفەو لایێ هەمو گولوك**

هەتا دەگاتە ئەم بەیتی (دەستی چناری ڕووت) تا دووایی باس باسی تەبیعەت و جوانی سروشتی دەکا، کە زۆر سودبەخش و جوانیشە کە باسی چنارو گوڵ و کانی و کلۆی بەفر کە دەڵی ئەم سەرشاخ و کێوو کەلە ڕازاوەتەوە بەو بەرگە جوانە کە سەر کێوەکان بەفر دایگرتوون و بنارەکانیش سەوزە گیاو دارودرختەکانیش پەلکە سەوزەکان ئەوجار (شاخ) و (کێو) و (کەل) یەك مەعنانین و یەك واتا نابەخشن و هەریەکە واتایێکی تایبەتی خۆی هەیە هەرچەندە وەك زاراوە ئێستا بۆ چیا بەکاردەبرێ بەڵام (کێو) بەو هەموو شاخ و کەلە دەگوترێ کە لە چیایێك هەیەو (شاخ)یش بەو شوێنە بەرزانە دەگوترێ کە هەر ماوەیێك قیت بووەتەوە (کەل)یش بەو شوێنە نزمانەی نێوان دوو شاخ دەگوترێ ئیدی چۆن (هەموو یەك واتا دەبەخشن) ئەوجار لێوی گوڵ لە کوردیدا بێ جێیە، چونکە دەڵی پەری گوڵ لێوی بۆ گوڵ نەهاتووەو لێرەدا بێمەعنا دەوەستێ، جگە لەمانە خۆیان لە دیوانە سێ قۆڵییەکە دەڵێن (نیوەی یەکەمی ئەم شیعرەمان بە گوێرەی نوسخەی (من) نووسییەوە کە لەوانی تر ڕاستتر بوو لامان تێکستی نوسخەکانی ترمان لەبەر زۆری هەڵەو مەعنا بە دەستەوەنەدان خستە پشتگوێ)




بەڵی لەبەر زۆری هەڵە! ئەوی دەستخەتی ئەم دوو زانایەو کەلا پایە بڵندو نالیزانی زەمانە چۆن هەڵەیان زۆر بوو و خزانە پشت گوێ؟!

ل 109 لە چاپی ئێمەدا: ل 261–264. لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 71

**بە زستان دڵ شکستەی بەردو سەرمام**

**بە هاوین جەستە خەستەی دەردو گەرمام**

(بەردو سەرمام: ڕاستەکەی (بەردی سەرمام)ە چونکە وردەکارییەکە وا تەواو دەبێ). کام وردەکاری کاکە؟ ئەوان لە دیوانەکەی خۆیاندا هیچ وردەکارییەك لە وشە ئارایشدا باسیان نەکردووە ئەگەر (بەردی) بێ چییەو ئەگەر (بەردو) بێ چێیە، بەڵام ئەوەندەیان نووسیوە دەڵێن (بەردی سەرمام: (چن) و )عم) (کم) و (ت) و "مز" و "من" نووسیویانە "بەردو سەرمام" و بۆ ئەو نوسخەی ئەوان هەڵیانبژاردووە چ باسێك نییە.

ئەوجا کاکە حەمە مەسەلەکەی وەك شتورمورخ وایە، کە بەشتورمورغ دەڵێن وەرە بار هەڵگرە، دەڵێ: من مورغم و بارم بۆ هەڵناگیرێ گەر بڵێن وەرە بفڕە دەڵێ من شتووم فڕینم بۆ ناکرێ، دەنا بۆچی هاوسەنگی ناوئاخنەکەی (خشو) نیوە بەیتەکانی دەکاتە نیشانەی ڕاستی وشەی "مووەنە" لە (مۆدنە) کە ئەم هاوسەنگی ناوئاخنانە لە عیلمی عەروزدا وەك باسمانکردوە پێویست نییە، گەر ببێ جوانەو گەر نەشبێ نابێتە نارێکی شیعرەکە، بگرە هەر قسەی تێدانکرێ، بەڵام هاوسەنگی عەروز لەگەڵ زەرب واتە هەردوو دووا وشەی نیوەی بەیتی یەکەم و دووەم جوانیێکی نایابە ئەگەر ببێ ئەگەر نەشبێ ئەویش لە شاعیر ناگیرێ، کە بۆ واینەکردووە، بەڵام بە هەموو جۆرو بە هەموو لێکدانەوەیێك هاوسەنگی دووا وشەکانی هەردوو نیوە بەیت جوانترو لەبارترە لە بوونی هاوسەنگی ناوئاخنەکانی نیوە بەیتەکان، ئەوجار بەبێ ئەوەی بڵێ وردەکارییەکە چییە هەروا بە نادیاری دەڵێ (وردەکارییەکە وا تەواو دەبێ). وەك لە شوێنێکی تر دەڵێ (نەم: ڕاستەکە ی (نم)ە ڕاستە لەگەڵ یەکەمدا هاوسەنگەو ڕاستیشە بە فارسی هەر مەعنای (نم)ی کوردی ئەبەخشێ، بەڵام ئاخۆ ڕاستە بۆ ئەم هاوسەنگییە ناپێویستە وشەیێکی فارسی لە جیاتی وشەیەکی کوردی بەکاربێنین).

دەی ئەگەر ئەم هەموو قسانەت ڕاستن ئەم هەموو "لەنگ" و (هاوسەنگە لە پای چی؟ کە نیوەی پتری کتێبەکەت لەمانەیەو بە هەڵەش، وەک دێتە بەرچاوم کاکە حەمە ئاوڕی لە نووسینەکانی خۆی نەدابێتەوەو هەر هەڵیڕێتبێ‌و چاپی کردبێ یان پێی وابووە مەسەلی عەرەبی (لکل مقام مقال) بەم جۆرە دەبێ جێبەجێ بکرێ.

تا بە جۆرێك کەوتۆتە ناو گێژەنۆ ئاڵۆزی و یەکدیگر نەبوون کە خۆی پێ ڕزگار نەکرێ.

ل 110 لە چاپی ئێمەدا: ل 312—313 لە چاپی دوکتنۆر خەزنەداردا: ل 75

**لەبت میم‌و قەدت ئەلف‌و زولف چیم**

**دەزانی بەم سێیانە تالیبی چیم**

(سێیانە: ڕاستەکەی "سیانە"یە) بۆ؟ هەر کاکە حەمە بە خۆی دەزانی. کورد بە ژمارەی (3) دەڵێ (سێ) بە دەنگی (س) لە نێوان ئەلف‌و یێ‌و بە ژمارەی (30)ش دەڵی (سی) بە دەنگدانی حەرفی (س) بە یێ، ئەوجا ئەگەر نیشانەی کوێ کە ئەلف‌و نونە چوە سەر دەبێتە دوو پیتی بێدەنگ لە تەنیشت یەکتری‌و پێویستە دەنگ بدرێتە پیتی پێشوو کە لێرەدا (ی)یەو دەبێ لە ڕەنگی خۆیشی بێ بۆیە (سێ) لە کۆدا دەبێتە (سی‌یان= سێیان) بۆیە ئەوەی دوکتۆر نووسیویە ڕاستەو ئەوەی ئەوان نووسیویانە هەڵەیەو نیشانەیە بۆ (30)، کەچی لێرەدا سێ (3)دانەن کە لێوو قەدوو زولفەو ئەوەی کاکە حەمە نووسیویە کە وەکو خۆیانی نەنووسیوە، ئەوە دەبێ لە کاکە خۆی بپرسین مەبەستی پێی چییە؟ دەنا هەر جێی نیە لە ڕێنووسی کوردیدا.

ل111 لە چاپی ئێمەدا: ل 271—276. لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 75—75

**خەنایی کردووە پەنجەی بە خوێناوی دڵی زارم**

**ئەمە ڕەنگی شەهادەت بێ کە کوشتەی دەستی یارم**

(ڕەنگی: ڕاستەکەی (ڕەنگە)یە ئەگەر واشبێ کە دوکتۆر نووسیویە ئەبێ (ڕەنگێ) بێ واتە (ڕەنگ بێ).

بە داخە ئەوەی ئەوان بە سێ قۆڵی نووسیویانە (ڕەنگە) و مەعنایان کردووە بەوە (لەوانەیە ئەم پەنجە سووربوونەی یار ببێ بە بەڵگە بە شەهیدی مردنی من کەوا بە دەستی کافرێکی بێڕەحمی وەک ئەو کوژراوم، یا ببێ بە شایەتی بۆم کەوا کوشتەی دەستی ئەوم)




هەردوو مەعناکە هەڵەیەو نووسینەکەش بەم شێوەیە هەڵەیە. ڕاستەکە: هەروەك دوکتۆر نووسیویە وایەو مەعانەکەش ئەمەیە: یار سەر پەنجەکانی خەناوی‌و سوورکردووە بە خوێناوی دڵی بریندارم، ئەمە واتە ئەم ڕەنگی سووری سەر پەنجانە ڕەنگی شایەتی‌و بەڵگەیە بۆ ئەوەی من کوشتەی دەستی دڵدارم زۆر ئاشکرایە بەڵام ئەوان بە دوو سەرە بە هەڵە چوون‌و لە هەردوو مەعناکەی ئەوان دوودڵی هەیە کە ئەم ناگونجێ بە هیچ جۆر.

ل 112 لە چاپی ئێمەدا: ل 288—292. لە چاپی دکتۆر خەزنەداردا: ل 78

(ئەم غەزەلەش وەك غەزەلی (35) لە دەسنووسەکانی بەردەستی ئێمەدا تەنها لە یەك دەستنووسدا هەبوو. دوکتۆریش کوتومت وەك ئێمەی نووسیویەتەوە تەنها لە بەیتی چوارەمدا نەبێ بە عادەتەکەی خۆی (بە صەرم)ی کردووە بە (سەڕم)و لە بەیتی حەوتەمیشدا (دوم)ی بە (دۆم) نووسیوەتەوە. بۆیە ئێمە بۆمان هەیە بڵێین دوکتۆر لە ئێمەی وەرگرتووەو دانی پیانانێ ئەگینا با بفەرموێ سەرچاوەکەی خۆیمان بۆ دەستنیشانکا). ئەم داوایە زۆر زۆر بێجێیە، یان بەچی دەزانی ئەو دەستنووسانەی لای دوکتۆر لە دەستنووسەکانی لای ئێوە پتر نین‌و باشتر نین من دەڵێم هەقیشمەو کە دەستنووسەکانی لای دوکتۆر لە دەستنووسەکانی لای ئێمە پترن‌و جێی متمانەن پتر، چونکە تا ئێستا تێکستەکانی دوکتۆر ساغی کردووەتەوە چاکترو لەبارترو جوانترن لە تێکستەکانی لای ئێوەو ئەو شیعرانەی لە دیوانەکەی ئەودا هەن پترن لەوانەی ناو دیوانەکەی لای ئێوە، چونکە خۆت دەڵێی لە لاپەڕەی ڕەخناوییەکە (67): (داوام لە دوکتۆر کرد ئەگەر زیاتری لایە بمداتێ، دوکتۆر وتی لای منیش هەر نۆزدە بەیت هەیە، کەچی ئێستا کە تەماشای تێکستی ئەم پارچە شیعرە ئەکەین لە نوسخەکەی هەردووکمان ئەبینین لای ئێمە نۆزدە بەیتە لای دوکتۆر 20 بەیتە).

ئەمە یانی دوکتۆر سەرچاوەی پتری هەیە، هی واش کە لای ئێوە نییە، بۆیە دیوانەکەی ئێوە نەبووە بە سەرچاوەی دوکتۆرو بۆ دڵنیایشت پێت دەڵێم هەر کەسێکی تر کە لە نالی بکۆڵێتەوە بە هیچ جۆر پشت بە دیوانەکەی ئێوە نابەستێ،

چونكە تا ئێرە بۆمان ساغ بووەتەوە كە ئێوە چەند دەستكاریتان كردووەو وشەتان گۆڕیوەو بەپێی دەستنووسیو سەرچاوەكان ڕەفتارتان نەكردووە وەكو لە پێشەكی دیوانەكەتان گفتان دابوو.

ل 113 لە چاپی ئێمەدا: ل 315–317. لە چاپی دوكتۆر خەزنەداردا: ل 79

**كە تۆ قیبلەی دەمت سابینە قوربان**

**لەبو قوبلە دڵم مەشكینە قوربان**

لەبۆ قوبلە: لە نوسخەكەی (عەلی موقبیل)دا نووسراوە: لە بۆ قوبلەی، دوكتۆر مارفیش لەوی وەرگرتووەو لە خۆەیوە (ی)كەی لابردووە چونكە بەبێ موناسەبەتی زانیوە. ڕاستە بەم جۆرە بێ موناسەبەتە بەڵام ئەبو ئەوەی بزانیبایە كە دیارە لە دەسنووسەكەی بەردەستی عەلی موقبیلدا (لەبۆ قوبلێ) بووە واتە (لەبو قوبلەیەك) و ئەو بە هەڵەی خوێندۆتەوە). خوێنەری بەڕێز بە هەڵەبردنی خەڵك وا ئەبێ، ئێستاكە خۆیان لە دیوانە سێ قۆڵییەكەی خۆیان نووسیویانە (لەبو قوبلە) ئیدی ئەم فەرەزییاتو جەدەلە مەلایانییەی بۆچییە؟ لەسەر دوكتۆری فەرزكردووە كە دیوانەكەی هەر لەبەر چاپەكەی عەلی موقبیلی نووسیوەتەوەو لە چاپەكەش نووسراوە (لەبوقوبلێ) نووسراوەو دوكتۆریش ئەم (ی)یەی لابردووە، چونكە بێ موناسەبەتی زانیوە، بەڵام دەبوو دوكتۆر دەرك بەمە بكا كە عەلی موقبیل بە هەڵەی خوێندۆتەوە. كاكە منو هەزاران خوێندەواری تر وا دەزانین كەسێكی دوكتۆرای لە زمانی كوردی وەرگرتبێ لە وڵاتێك وەكو ڕوسیا كە هەزاران دەستنووسو نووسینەوەی ڕۆژهەڵاتییەكانیان، لەسەر پیاوە بەناوبانگەكانو شاعیرەكانی كوردستان هەیە، دیارە ئەم دوكتۆرە لێكۆڵینەوەكەشی وەرگیراوە، بەمەڕا كەسێكی لە دوای شت گەڕابێو دوكتۆرای وەرگرتبێ ئەمڕۆ بێ لە دیوانێكی شاعیرێك بكۆڵێتەوە، بێگومان هەمان ڕێڕەو دەگرێ، كە لە دوكتۆراكەی گرتوویەتی، چونكە ئەگەر خۆشی ئەو ڕێگایەی نەزانیبێ، پرۆفیسۆری سەرپەرشتی پێی گوتوە، خۆ كاكە حەمە ئەمەش ناكاتە مەسەلەی قامووسی عەمید كە لە لاپەڕە (222) كتێبە ڕەخناوییەكە دەڵێ (بەڵام فارسیەكە خۆیشی هەڵەیە) و بڵێ پرۆفیسۆرەكەو هەرچی لە زانكۆكانی ڕوسیش هەر هیچ، تەنها فەقێو مەلای مزگەوتی بیارەی خۆیان! دەنا ئەم گوتە بێتامو بۆیانە چی دەگەیێنێ؟! جا پاش ئەم قسانەش دەبێ ئەوەندەش بڵێم كە تا ئێستا لە نووسینەكانی دوكتۆر چاومان پێنەكەوتووە بڵی وا نووسرابوو من گۆڕیم بەڵام ئەوان بە زمانی خۆیانی سێ قۆڵی دەڵێن لە هەموو نوسخەكاندا نووسرابوو بەڵام ئێمە لامان وابوو هەڵەیە، بۆیە گۆڕیمانو وامان نووسی. دەی كەوایە ئێوە نوسخەتان هەبێو نەبێ هەروەكو یەكە، چونكە دیارە بە دڵو ئارەزووی خۆتان شیعرتان بۆ "نالی" ڕێكخستووە. وەڵڵا كاكە حەمە حاشا من پشت بە نوسخەی وا نابەستم كەڵكی ئەوەشی پێوە نییە خەڵك لێكۆڵینەوەی لەبەر بكاو بیكا بە سەرچاوە:




ل 113:

**ئەگەر دڵ غەیری حوبی تۆی تیابێ**

**بە دەستی خۆت دڵم دەربینە قوربان**

(ئەگەر دڵ: لە زۆربەی نوسخەكاندا (شەقی كە)یە ڕاستیش ئەمەیە چونكە ئەگەر (ئەگەر دڵ) بوایە (دڵم)ی نیوە بەیتی دووەمی بەیتەكە پێویست نەئەبوو ئەبو بە ضەمیر بوایە لە جێگایدا بووترایە (دەری بینە) جگە لەوە كە (شەقیكە) كە مەعنایەكی زیاتریش ئەدا بە بەیتەكەو جوانتریشە) نابێە خەیاڵم لە كوردیدا كردار پێش مەفعول بكە،ی ئەمە یەكە لە خاسیەتەكانی زمانی كوردی بەڵی لە عەرەبیدا مەفعول پێش دەكەوێ، لەبەر هەندێ خاسیەت، بەڵام لە كوردیدا ئەمە نییە سەرباریش وشەیێك لە دوولا مەفعولی دوو فیعل بێو لە هەمان كاتیشدا سەربەخۆ بێو موبتەدای خەبەرێكی تر بێ، وەك خۆیان نووسیویانە لە لاپەڕە (316) پەراوێز (3) دەڵێن: (وشەی "دڵم" لە لایەكەوە مەفعولو بیهی "شەقیكە"یەو لە لایەكی كەوە موبتەدایەو (غەیری.. تاد) خەبەریەتیو لە لایەكی تریشەوە مەفعولوبیهی "دەربینە"یە". ئەم جۆرە گرامەرە مەگەر هەر لەلای سێ قۆڵییەكە هەبێ دەنا شتی وا نییە، تا لە عەرەبیش شتی وا نییە، چونكە لە "تەنازع"ی عەرەبیشدا نابێ لە دوو پتر بێ یا فاعیلی دوو فعل یا مەفعولی دوو فیعل، كەچی لێرەدا بوەتە (تریپی تەنازع). لەگەڵ ئەمانەی گوتمان ئەنجا نوسخەكەی (چر) كە خۆیان زۆریان پێداهەڵگرتووە لەگەڵ نوسخەكانی (عم)و (كم) و

(گم) و (خب) و (ك) یەکیانگرتوە لە نووسینی "دڵ" ئیدی (شەقیکە) مەعنای پترو جوانرتیشە لە کوێ!؟ سەربازیش نیوە بەیتی یەکەم کە وەك ئەوان نووسیویانە لەنگە، کە خۆیان لێکردوین بە وەستای عەروزو عەروززانی بێهاوتا لەسەر دەمی ئەتۆمەوە.

ل 114 لە چاپی ئێمەدا ل 326–330 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا:

ل 81

**ڕەقیب و موددەعی فیتنەو عەلاقەی چاوی جادووتن**

**لە گۆشەی گووشوا ڕەت نایبی هارووتۆ مارووتن**

(گووشوا ڕەت: بە فارسی وایە بە کوردییەکەی (گوشەوارەت)ە). مەگەر لە شێوە زەمانەکەی کاکە حەمە، دەنا کەی لە کوردیدا لە چ شێوەیێك لە گوێ ئەڵێن "گۆش" تا وشەی "وارە"ی پێوە بلکێندرێ واتای ئەوەی بۆ ڕازاندنەوەی گوێداندراوە بگەیەنێ. کورد دەڵێن "گوێ- گوە" وشەی (وارە)ی پێوە بندرێ دەبێتە "گوی وارە- گوەوارە" ئیدی کاکە (بە کوردی‌یەکەی گوشەوارەیە) لە کوێ‌ما؟!

ل 115 لە چاپی ئێمەدا: ل 326–330 لە چاپی دکتۆر خەزنەداردا: ل81

**گەلیٚ شیرو پلنگ و فەهدو بازو شاهینی شاهی**

**وەکو (نالی) بە دڵ نەخچیری راوی چاوی جادوتن**

(گەلی: ڕاستەکەی "گەلێ"یە). نازانم کاکە حەمە بۆ وشەی "پلنگ"یشی لەسەر نوسخە چاپەکەی خۆیانی ڕاست نەکردووتەوەو بڵێ پڵنگ: ڕاستەکەی "پۆلەنگ"ە چونکە ئەوان وایان نووسیوە لە تێکست و پەراوێزیش لە کوردیدا پڵنگ و لە فارسیدا پەلەنگ. ئیدی ئەم (پۆلەنگە) لە کوێوە هات، دەبێ ئەمەش هەر شێوە زمانی حوجرەکەی پێشوی بیارە نەبێ؟)

ل116 لە چاپی ئێمەدا ل 337–340 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 82

**دەندان گوهەرو لەب شەکەرو پەنجە بلوورن**

**ناسك بەدەن و موو کەمەروسیم سورینن**

(دەندان: بە کوردی (دنـدان)ە (دنـدان) فارسییە) لە کوێ کاکە حەمە بە (بەددان) دەڵێن (دندان) ئەمەش دیارە هەر ئەو شێوە زمانەیە کە لە پێشەوە باسمانکرد؟

ل 117 لە چاپی ئێمەدا ل 333–337 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: 81–84




**حیکمەتی تو مولهەمە هەم قەدەمت مەرحەمە**

**موستەحەقی مەرهەمە سینەیی ئەفکاری من**

(موستەحەققی! ڕاستەکەی "موستەحەقی"یە بە نەگرتنی (قاف)ەکە ئەگینا سەنگی بەیتەکە تێك ئەچێ). بە پێچەوانەیە بە نەگرتنی (ق)ە کە سەنگی نیوە بەیتەکە تێکدەچێ و ڕاستەکەی ئەوەیە کە دوکتۆر نووسیویە، نازانم کاکە حەمە دەم ئەکاتەوەو ناکاتەوە هەر باس باسی عەروزە کەچی دەبینین هەندی بەیت لە نگ دەکا کەچی لەنگ نییەو هەندێ تر بە ڕاستی دەزانێ کەچی لەنگە وادیارە پێوانەیێکی تایبەتیان هەیە بۆ عەروزو عەروزەکەی خەلیلیان لا هەڵەیە وەکو لە شیعەرکانی نالی کە دەڵێن هەموو نوسخەکان وایان نووسیبوو بەڵام ئێمە لامان وابوو هەڵەیە بۆیە گۆڕیمان، یان وەکو کاکە حەمە بەرامبەر بە فەرهەنگی عەمید دەڵێ (بەڵام فارسییەکە خۆیشی هەڵەیە). لەبەرئەمە حەزمان دەکرد ئەم تەفعیلاتە نەبیستراوانەی کاکە حەمەمان بزانیبایەو ئێمەش دەست بە خێرەوە نانێین ئینشائەڵڵا.

ل 119 لە چاپی ئێەدا: 345–349 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 86

**بلا (نالی) بە ئەربابی وەفابین**

**هەمو موحتاجی خاك و بیل و پاچین**

(بلا: هەرچەندە لە زۆر نوسخەدا بەم جۆرەیە بەڵام ڕاستەکەی "بڵێ"یە بین: یشی ڕاستەکەی (بێن)ە لە مەصدەری (هاتن)ەوە). بە ڕاستی کاکە حەمە ئێوە بە سێ قۆڵی و لە دواییشدا بە تەنها خراپ بوی چون و مەعناکە ئاشکرایە، چونکە "نالی" بەم شیعرە ڕوو لە خۆی و خەڵکی دەکاو دەڵی خەڵکینە دونیا هێندە ناهێنێ و هەموومان دەمرین و دەچینە ژێرخاك بە لەگەڵ یەك بەوەفابین: ئەربابی وەفا- خاوەن وەفا موحتاجی خاك و بیل و پاچ) ئیشارەتە بۆ گۆڕ هەڵکەندن و مەبەستی مردنە ئیدی (بڵێ با خاوەن وەفابین) یانی چی کە خاوەن وەفا هەیە پێویست بەم بانگەوازییە ناکابرا!

ل 119 لە چاپی ئێمەدا: 367–370 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 87

**هەرچەندە کە عومری خدرو جامی جەمت بوو**

**چونکە ئەمەلت زۆرە چ عومرێکی کەمت بوو**

(خدر: لە هەموو دەسنووسەکانی بەردەستی ئێمەدا "خضر"ە لام وایە لە هەموو

دەسنووسێکدا هەروابی. وادیارە دوکتۆر خەزنەداریش شوێنپێکەی مامۆستا گیوی هەڵگرتووە کە هەر وشەویەکی عەرەبیی لە شیعری کوردیدا بدیایە بە ئارەزوی خۆی ئەیگۆڕیو ئەیکرد بە کوردی). نازانم ئەم بەرەیەو برادەر کاك مەلا موحەممەد عەلی قەرەداخی بۆچی وا بە موناسەبەتو بێ موناسەبەت ئاوا لە مامۆستا گیوی ڕەحمەتی داخدارنو پلارو توانجو تانەی بێجێی لێدەدەن، ئەوجار ئەوەندە ئەوان بە سێ قۆڵی وشەی شیعری نالییان گۆڕیوە، مامۆستا گیو وای نەکردووەو ئێستا پاش بەراوردکردنێك لەگەڵ نوسخەچاپی مامۆستا گیوو نوسخەچاپی ئەوان دەبنیم لە زۆر جێگا ئەو دەقە شیعرەی مامۆستا گیو پە سەندی کردووە ئەوانیش ڕاست هاتوون تێکستەکەی دیوانە سێ قۆڵییەکەی خۆیانیان لەبەر نووسیوەتەوە، هاتومەتە سەر ئەو قەناعەتە ئەمانە دەقاودەق هەندێ شوێن نەبێ تێکستی دیوانەکەی خۆیانیان لەبەر تێکستی مامۆستا گیو نووسیوەتەوەو بۆیەش هێندە بە خراپ ناوی دەبەن بۆ ئەوەی خەڵك وا تێبگا کە ئەوان لەبەر تێکستی مامۆستا گیویان نەنووسیوەتەوە پێوانەیێکی قانوونی هەیە بە عەرەبی دەڵێ (المجرم یحوم حول جریمته) واتە تاوانکار لە دەوروپشتی تاوانەکەی دەسوڕێتەوە، بەمەرا دیارە ئەوان زۆر کەڵکیان لە نوسخە چاپەکەی مامۆستا وەرگرتوە، یا هەر لەبەر نوسخەکەی ئەویان نووسیوەتەوە دەنا بۆچی دەبێ هێندە باسی بکرێ بە خراپە؟؟ یان ئەمە پاداشتی مامۆستایە، لە کاتێکدا وەك لە پێشەوە باسمانکردووە بەناو دەڵێم ئەم برادەرانە حازر نەبوون بە کوردی جوێنێك بە کورد ڕەوابیبنن ماستا گیو ڕۆژنامەیو گۆڤاری بە کوردی دەردەکردنو شوێنەواری ئەو شاعیرە کوردانەی زیندوو دەکردەوەو دیوانەکانی چاپ دەکردن، لە زۆربەی زۆریشیان خەسارەتمەند بووەو مامۆستا بە درێژایی تەمەنی کە کارو کاسبی کردووە لە ڕێگەی چاپەکەی دەتوانم بڵێم چواریەکی ئەم بڕادەرەی خۆمانی بۆ کۆنەکراوەتەوە، کە ئەمیان لە نێوان شەش حەوت ساڵ کۆیکردۆتەوە. جا توخوا ئەمە هەقە؟ ئەمە پاداشتی چاکەکەیەتی؟ ئەمەیە مەسەلی کوردی دەڵێ "تا خاوەن ماڵ دزی گرت دز خاوەن ماڵی








گرت" ئەوجار (خضر)ی عەرەبی هیچ کوردێك بەم شێوەیەی ناخوێننەوە هەمووی بە (خدر)ی دەخوێنێتەوە، وەك کاکە حەمە گوتەنی ئەم ناوە بووەتە کوردی وەك لە پێشەوەش باسمانکردووە هەر میللەتە هەر وشەیێکی میللەتێکی تری بەکارهێناوە وەك شێوە زمان ئەلف بێ خۆی بە کاریدەهێنێو قەتی نابێ چاوەنواڕی ئە وەبین کە وشەکان وەك خۆیان بەکاربرێنو ئەمە ڕێڕەوی هەموو میللەتانی جیهانە، تەنها بە ڕەبابی کاکم نەبێ کە دەیانەوی بە سە هەر وشەیێك وەك خۆی بەکاربرێو ئەگەر حەرفەکەش لە کوردیدا نەبوو ئەوا ئەو حەرفەی ئەو زمانەش بێنینە ناو کوردیو بەمە زمانی کوردی دەوڵەمەند دەکرێو ئەگەر وانەکرێ دەس بە خێروەنانە.

ل 121 لە چاپی ئێمەدا ل 375– 378 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 89

**ریققی‌یەتی تەن ریققەتی دل ریقەتی گەردەن**
**مەخسوسی ڕەقیب بوو لە منی خەستە ڕەقی بوو**

(ریققی‌یەتی: ڕاستەکەی یا (ڕەققی‌یەتی) یا (ڕەققیّتی)یە وشەی (ریققی‌یەت) لە زمانی عەرەبیدا نییە. ئەگەر مەبەست لێی مەعنای بە ندەگی بێ ئەوە (ریقق= رق)ە).

ئەوەی ئەوان نووسیویانە بە سێ قۆڵو بە واتا ڕەقی لەش بێ وانییە، چونکە لەش ڕەق نییەو بۆ بەرگەگرتنیش ناگوترێ ڕەق لە کوردیدا "ڕەقی" بۆ نەگونجان دەگوترێ. ئەوجا "ریقی‌ییەت" کێ دەڵێ عەرەبییە؟ تا تۆ بڵێی لە زمانی عەرەبیدا نییە، وەك "ڕازی‌یەت" عەرەبی نییە ئەمەش ئاوا عەرەبی نییە بەڵکو ئەم جۆرە وشانە لە ئەسڵدا عەرەبینو کوردی مەلایانە دەیانکەنە مەصدەری داڕێژراو.

ل 121 لە چاپی ئێمەدا: ل 391–394 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 92

**ساقی بەمەیی کوهنە لەسەر عادەتی نەوبە**
**بشکینە بە یەك نەو بە دووسەد ماتەمی تەوبە**

((نەبو)ی یەکەم ڕاستەکەی (نەو بە)یە کە (نەو) بە مەعنا (نوێ) بێو (بە)یش فیعلی ئەمر بێ لە مەصدەری (بون). دوو ئەبێ بە یەك (و) بنووسرێ ئەگینا نیوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ). کاکە حەمە مەیگێران لەسەر عادەتی نوێ یانی چێ؟

ڕاستەکەی وەکو دوکتۆر نووسیویە وایە، چونکە (نەوبە) واتە نۆرە نالی بە ساقی دەڵێ وەرە لەومەیی کۆنە لەسەر ڕێو شوێنی نۆبە بە نۆبە وەك یەکەم جار پیالەیێك دینیو جارێکی تریش هەروەها تا مەست دەبێ ئەم نۆرە بە نۆرەیە عادەتێکی شەرابخۆرانەیە لە مەیکەدان ئێستاش لە زۆر شوێن لە مەیکدەوبارەکان ئاوایە، هەمیشە پێك پێك دەخۆنەوە، بەلاّ ملە شوێنی تر وەك لای خۆمان مەیخۆر چەند دەتوانێ بخواتەوە بە یەك جار داوا دەکا. عادەتی دانی شەراب ڕێبازی نوێی نییە. جا نالی وەك بڵێ بە زاراوەی ئەمڕۆ وەر ساقی پێك پێك شەرابم بدەیەو بە یەك پێك بشکێنە دوو سەد ماتەمو خەمی تەوبە. ئەوان لێرەدا بە سێ قۆڵی بە هەڵە مەعنایان کردوەو ناهەقیشیان نییە، چونکە شەراب خۆرنین. ئەوجار (دوو) کە دەڵێ دەبێ بە یەك (و) بنووسرێ دەنا لەنگ دەبێ دیسان بە داخەوە وشەی (دوو) ئەگەر بە یەك (و) بنووسرێ لەنگ دەبێ بە پێی عەرۆز نەك بە پێی زەوقی کاکە حەمە.

ل 124 لە چاپی ئێمەدا ل 406– 411 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 94

**پەیامت هات پێی گوت ڕووی خەیاڵ ناردە دووی گەیییە**
**ڕەسوڵم کەوتە ڕێگرتنی هەنای وەك ئاگرە سوورە**

نوسینەوەی ئەم بەیتە بەم جۆرە نیشانەی ئەوەیە دوکتۆر خەزنەدار هیچ خۆی بۆ ڕاستکردنەوەی تێکستی شیعرەکان ماندوو نەکردووە ئێمە ئەم بەیتەمان بەم جۆرە نوسیوەتەوە

**پەیامت هاتو پەیکت روی خەیاڵمو ناردو نەیگەییی**
**رەسوولم کەوتە رێ گرتی هینای وەك ئاگرە سوورە**

لێرەدا کاکە حەمە نەیزانیوە چ بکاو چ بڵێ؟ ئەگەر دەڵێ ئەم بەیتە ڕاستەکەی وەکو ئێمە نووسیومانە وایە ڕەنگە کەسێ هەبێ تەماشای مەعنای ئەوان بکا کە تەماشا دەکا دەبینی ئەوان لە لاپەڕە (408) پەڕاوێزی (4)ی دیوانە سێ قۆڵییەکەیان نووسویانە: (مەعنای ئەم بەیتەو بەیتی باشەوەیمان بە ئارەزوی دڵی خۆمان بۆ ڕاست نەکراوەتەوە). دەی بەڕێز کە خۆتان بە سێ قۆڵی بۆتان ساخ نەبوبێتەوە، چۆن بە دوکتۆر دەڵێی خۆی ماندونەکردووە یان ڕاستەکەی وەکو



ئێمە نووسیومانە وایە؟! خۆت گوتەنی هەی خوا لێت خۆشبێ کاکە حەمە.

ل 124 لە چاپی ئێمەدا ل 406–409 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 94

**گوتم: ڕاستی سەبا هەستە، گوتی مەشرەب موخالیفیە**
**گوتم: ناری، گوتی بایە، گوتم ئەوجێ، گوتی، دوورە**

ناری: ڕاستەکەی "ناری"یە ئەوجی: ڕاستەکەی (ئەوجێ)یە. عەرەب دەڵێ (اذا لم تستح فاصنع ماشئت) ئەگەرنا نازانم ئەم برادەرە چۆن دەتوانێ بنووسێ ڕاستەکەی وایە، واتە وەك ئەوان کە خۆیان بە سێ قۆڵی نووسیویانە، کەچی ئەوان بە زمانی خۆیان لە لاپەڕە (409) بەراوێزی (6)ی دیوانەکەیان دەڵێن (مەعنای ئەم بەیتەمان بە یەکجاری بۆ ڕاست نەبوەوە). دەی کە بە خۆیان مەعنای نەزانن چوزانن ڕاستو ناڕاست کامەیە؟ سەرباریش لە هەمان پەراوێزدا لاپەڕە (410) دەڵێن (وشەی موخالیفیە لە هەموو نوسخەکانی بەردەستمانا بە (موخالیفە) نوسرابوو شیعرەکە بەوە لاسەنگ دەبوو ئێمە خۆمان کردمان بە (موخالیفیە).) خوێنەری بەڕێز کەسێك مەعنای ڕستەیێك یا بەیتێك نەزانێو بۆی نەسازی کە تێکستێکی مەعنادارتر هەڵبژێرێ دەبێ چەند ڕەوابێ کە ببێ بە حەکەم؟ ئەمە ڕاستەو ئەمەیان ناڕاستە یان بڵێ لەنگ دەبێ تۆ کە نەتوانیبێ مەعنا بزانێو وشەت ڕیزکردبێ بە چ هەقێك لەنگی دەکەیت. ئەوجار بە "موخالیفە"ش بنووسرێ لاسەنگ نابێ چونکە حەرەکەی ژێر لە وشەکە درێژتر دەخوێنینەوەو بەمە لاسەنگ نابێو لە پێشەوە ئەم جۆرە شتانەمان ڕونکردەوە.

لاپەڕە 126 لە چاپی ئێمەدا: 466– 470 لە چاپی د. خەزنەداردا: ل 100

**ئەم ئەرزە مەزرعی عەمەلەو گولخەنی ئەمەل**
**هەندێ بووە بە مەسجیدو بەعزێ بە مەزبەلە**

هەندێ: ڕاستەکەی (هەندی)یە واتە هێندێکی: بەعزێ: ڕاستەکەی (بەعزی)یە. کاکە حەمە تەواو پێچەوانەی زمانی کوردی کردوەو هەڵیگێڕاوەتەوە، چونکە لە کوردیدا هەندی واتە هیندێکیو بەعزی واتە بەعزێکی، بەلاّم کە گوترا (هەندی) وا بە ئەندازەی لێرەدا وایلێدێتەوە ئەگەر (بەعزێ)ی نەنووسیبایە ئەوەندەی بوەتە مزگەوت بەو ئەندازەیە بووەتە کگوفەكو سەرنوێلك، بەلاّم

دیارە مەبەستی نالی وانییە بەڵکو دەڵی هەندێکی بوەتە مزگەوتو هێندێکی تر بە گوفەک کورد دەڵێ: (فلانە کەس هەندی منی کتێب هەیە) واتە بە ئەندازەی من کتێبی هەیەو کە گوتی: فلانە کەس هەندێ کتێبی هەیە واتە کەمێكو زۆرنا. نازانم کاکم بۆ وا سەری لێشێواوە؟

ل 129 لە چاپی ئێمەدا ل 520–524 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 103

**لە سایەی هیمەتی شەخسی بڵند ئاسودەیە شارێ**

**بەلی خیتەی سلیمانی سەوادی زیللی کودروونە**

هەرچەندە نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە لە دەسخەتەکانی بەردەستی ئێمەدا بەم جۆر بووە: (لە سایەی شەخصێکی هیمەت بڵند.. تاد) ئەو جۆرەش کە دوکتۆر مارف وەریگرتووە، زۆر لە جێی خۆیەتی ئەگەر بتوانین (گودروون) بە (پیرەمەگروون مەعنا لێبدەینەوە) لێرەدا هیچی تری ناوێو دەرکەوت سەرچاوەکانی لای دوکتۆر دەوڵەمەندترن ڕەخنەکانی تر کە لەم شیعرەت گرتوون نابەجێن

ل 129:

**وره سەیری خیابانی بەیازی دەفتەری (نالی)**

**مە سەف سەف مەسرەعی بەرجەستە ڕێزی سەروی مەوزوونە**

(خیابانی بەیازی: دیارە هەموو نوسخە دەستنووسەکان نووسیویانە (خیابان بیاض) کە ئەگەر گوێ نەدەینە واتا هەردووکیان بۆ ئەوە دەستنەدەن ئاخریان (واوی عەطف) یا (یەی ئیضافە) بێ بەڵام ئەوەی لێرەدا ڕێگای ڕاستمان پیشان ئەدا زانینی مەعنای بەیتەکەیە مەبەست لە (خیابان) هێڵە سپیەکانی نێوان دێڕەکانە بە ئاسودەیی. مەبەستیش لە (بەیاض) بەشە نەنووسراوەکانی چواردەوری بەیتەکانو هێڵە ستوونییەکەی نێوان دوو نیوە دێڕەکانە. (سەرو)ەکانیش نیودێڕە بەیتە بە ڕەش نوسراوەکانن کەواتە (خیابانی بەیازی) هەڵەیەو ڕاستەکەی (خیابانو بەیاضی)یە. (ڕێزی)یش هەڵەیە چونکە مەبەست (ریزی)ی نیوە بەیتەکانە کە وەك سەرووان جگە لەوە کە (ڕێز)ی بە مەعنا (حورمەت) نە بۆ ئەم شوێنە دەس ئەداو نە لە زمانی کۆنیشمان وابووە). وەك چەند جار باسمانکردووە لە شێوە نووسینی کۆن (و)ی عەطف دەنووسرا چونکە عەطف بە حەرەکە جێبەجێ نەدەکراو نەدەشکرێ. بەڵام ئیزافەو سەروبۆر وەك ئێستا بە حەرف جێبەجی نەدەکران بە حەرەکە جێبەجێ دەکران، وەك لە




شێوە نووسینی زمانی عەرەبیو فارسی، بۆیە وەك کاکە حەمە دەڵێ لە هەموو نوسخەکانی بەردەستیان نووسراوە "خیابان بیاض" ئەمە وا دەگەیینێ ە ئیزافە بێ کە ڕێنووسی ئێستا دەبێتە "خیابانی بەیاز" لێرەدا ئیزافەکە دوو ڕێی تێئەچێ یەکێکیان ئەوەیە کە ئیزافە بۆ دیارکردن بێ ئەوکاتە مەعناکە وایلێدێ: شەقامێ لە سپیاتی نێوان دوو بەیتان بە درێژیو نێوان نیوە بەیتەکان بە سەرەوخواری وەك لە نوسینەوەی شیعری پێشان وەدەرکەوت کە بەیتەکە بە درێژی دەنووسرا هەر نیوە بەیتە ئەکەوتە لاییێك لەهەر لاپەڕەو لە ناوەڕاستیشداو لە نێوان هەردوو نیوە بەیت بۆشاییێك بەجێدەهێڵدرا بەم جۆرە نێوان دوو دێڕ سپیاتییەکە، وەك شەقامی لێدێو هەر وەهاش نێوان دوو نیو بەیت لەسەر تا خوار سپیاتییەکە وەك شەقامو شەکانو بەیتەکان وەك داری سەروو بە پێوانە بێزیادو کەم.

دووەم ئیزافەکە ئیزافەی زەرفی بێ ئەوکاتە دەبێتە شەقامێك کە دروستکراوە لە سپیاتی دەفتەری نالی کە هەر لاپەڕە سپییە هاتوە شەقامی لێدروستکردوون بەو بەیتو شیعرانە کە لە نێوان هەردوو دێڕو هەردوو نیو بەیت شەقامی پەیدابووە بە درێژیو بە سەرەو خواری، ئیدی مەعناکانی تری وەك پێشوو دیارە.

وەك ئەوان نووسیویانە کە "بەیاز" ئەو سپیاتییەی دەرووپشتی نوسراوەکەیە لە دەفتەری نالی باسکردنی ئەم سپیاتییە چ هونەرێکی تێدا نییە، چونکە ئەو سپیانییە زیادەیە دەتواندرێ هەمووی لێبکرێتەوە تەنها نووسینەکان سپیاتی نێوان دێڕەکان بهێڵدرێتەوە بۆیە (خیابانو بەیاض) کە وەك ئەوان نووسیویانە ڕاست نییە ڕاستەکە هەر ئەوەیە کە دوکتۆر نووسیویەو ئەوان بە سێ قۆڵیو لە دوایشدا کاکە حەمە بە تەنها بە هەڵەچوون.

ل13– لە چاپی ئێمەدا ل: 524– 528 لە چاپی دوکتۆر خەزنەداردا: ل 103–104

**تەلعەتی ئایەتی جان مەزهەری ئیعجازو بەیان**

**لەبی دورجو دەهەنی سررو کەلامی عەلەنە**

ئیعجازو بەیان: ڕاستەکەی (ئیعجازی بەیان)ە چونکە (بەیان)ەکەی (موعجیز)و (بەیان)و (ئیعجاز) لێرەدا دوو شتی جیاوازنین. سرر: ئەبو بی نوسیبایە (سڕڕ) چونکە وشەکە عەرەبییەو نەبووە بە کوردیو (ڕ)کەشی (ڕ)ی قورسە دوکتۆر

هەموو جارێ کە دوو (ر)ی گیراو یەك ئەگرن ئیشارەتەکەیان لەسەر هەڵئەگرێ.

ئەمەش وانییە کاکە حەمە، چونکە بەیان عەطفە لەسەر ئیعجازو عەطفەکەش بەیانەو ئەمەش بەپێی ڕێزمان شتی جوانەو ڕەوانبێژییە چونکە ئیعجاز لە زۆر شت دەبێ کە (بەیانی) لەسەر عەطف کرا دەردەکەوێ کە ئیعجازی لە گفتوگۆو قسەی مەبەستەو هی تر نا، وەك ئەوانیش نووسیویانە بە (ئیعجازی بەیان) دیسان وەك ئیزافەی بەیانی هەمان مەبەست دەدا، لیرەدا لە ڕووی مەعناوە هیچ لایێك هەڵە نییە دەمێنێتەوە سەر ئەوە ئەسڵەکە چۆن نووسرۆاوە بە خۆیان لە لاپەڕەی 526 کتێبەکەیان وەکو ئیشارەیان کردووە زۆری نوسخەکان بە (و)ی عەطفیان نووسیوە لەبەر ئەمە دەبێ تێکستی بە (و)ی عەطفەوە هەڵبژێردرێ.

وشەی (سرر)یش هەموو کورد بەکاریدێنێ لە خوێندن و نووسین قسەش خوێندەوارە نەخوێندەوار، ئیدی بۆ نەبووە بە کوردی؟ بوون بە کوردی چۆنە لە پێوانەی ئێوە قوربان؟ ئەوەیە کە ئێوە بە خۆتان بینووسن؟؟

ل 30:

**ڕەوشەنی دیدە بە ئینسانە کەموژدەی قەدەمت**
**ڕەوشەنی دیدەیی غەم دیدەیی بەیتولحەزەنە**

من نازانم دەوکتۆر مارف بۆ وا سوورە لەسەر ئەوە کە هەر وشەیەکی لە کوردیو فارسیدا لەیەك جووی دێ، بیخاتە سەر فارسییەکە کە کورد خۆی کە (ڕۆشنی) هەبێ پێویستی (نالی) بە (ڕەوشەنی)ی فارسی چییە؟ جارێ وەکو چەند جاری تیرش باسمانکردووە، وشەی (ڕۆشن) یان (ڕەوشەن) هەر فارسیەو کوردیمان هەیە ئەگەر نالی مەبەستی بووایا وشەی کوردی بەکاربێنێ لێرەدا دەینووسی "روناك" ئەمە لە لایێك لە لایێکی تر ئەوان کە زۆر باسی ڕەوانبێژیو بردنەوەی هەر وشەیێك بۆ ئایەتی قورئانو ئەو حیکایەتانەی لە قورئاندا هاتوون دەکەن لێرەدا کە نالی ئیشارەی کردووە بۆ مەسەلەی یوسفو یەعقوبی باوکی، کە لە خەفەتخانەکەی خۆیدا چاوی کوێربووبوو ئەوان هیچ باسێکی وایان بە خەیاڵدا نەهاتووەو زۆر بە سادەیی مەعنایان کردووەو وشەی (غەم دەیدەیی) بە یەك وشە نووسیوە، کە وردەکارییەکەی لە دەستداوە. بەڵام دوکتۆر باشی بۆچووە کە "بەیتولحەزن)ی ئیشارە کردووە بەم ژوورەی کە یەعقوبی تێدا ژیاوە بە خەمو ناسۆرەوە لەبەر بێئاگایی لە یوسفی کوڕی، وەك لە قورئاندا هاتوە لە سورەتی یوسف ئایەتی (84 (یا اسفی علی یوسف وابیضت عیناه من الحزن فهو کظیم) ئینجا کە موژدە دەدەنە یەعقوب چاوی هەڵدێنێو دەبینێ، کە لە قورئاندا دەڵێ (فلما ان جاءه البشیر القاه علی وجهه فارتد بصیرا) سورەتی یوسف ئایەتی 96 جا بەم جۆرەی ئەوان نووسیویانە سادەیە بەڵام کە وەك دوکتۆر نووسیویە جوانەو وردەکاری تێدایەو ئیشارەتیشە بۆ ئەم مەسەلەی یەعقوبەو مەعنای بەیتەکە بەم جۆرە دەبێ: کە موژدەی قە دەمت ڕوناکییە بۆ غەمدیدەو خەمخۆر کە نالییە وەك ئەو موژدەیە وایە کە درا بە دانیشتوی بەیتولحەزەن کە یەعقوبە، چۆن ئەو موژدەی مافی یوسفە چاوی پێ ساخ بووەوەو خەم نەما ئاواش موژدەی هاتنی یار خەمی نالی نەهێشتو چاوێکی کە سپی بووبوو لەبەر گریانو نابینابووبوو بینابۆوەو خەمو پەژارە نەما.

ل 131 لە چاپی ئێمەدا: 532—538 لە چاپی د. خەزنەداردا: ل 104—105

**هەر جوگەوو جوباری کەوا سوورو سوێربێ**
**جێی جۆششی گریانیمنە خۆن نەڕژاوە**

جۆبارێ: دەبوو دوکتۆر نوسخەی (جێگێکی) هەڵبژاردایە، یەکەم: لەبەرئەوە کە (جۆبار)یش هەر جۆگەیەو زیادەیەکی تیانییە، بەڵام (جێگە) (جوگە( نییە. دووەم: لەبەرئەوە کە کۆکردنەوەی (جوگە) و (جێگە( وشە ئارایییەکی جوانی لێپێکدێ.



کاکە حەمە چۆن (جوبار)یش هەر جۆگەیە؟ جۆگە! واتە ڕوباری بچووكو (جوبار)یش واتە قەراخو لێواری ڕوبار. جێگەو جۆگە دوو وشەی لێکدوورن لە پاشان کێ تامی جێگە دەکا تا بزانێ سوێرە یانە، تا نالی ڕوو لە خەڵك بکا بڵی هەر شوێنێکتان تامکرد سوێر بوو، ئەمە خوێنی منە لێڕژاوەو سوێری کردووە، هەرچەندە ئەوەی ئەوان بە سێ قۆڵیو دووبارەی کاکە حەمە نووسیویانە دوورە بۆ ئەم شوێنە بەڵام لەگەڵ ئەوەش کە بڵێن باشە مەعنا لێدانەوەکەیان دوورەن چونکە سوور بۆ جێگە دەبێ کە خوێن لە شوێنێك بڕژێ سووری دەکاو ئاویش سوێر دەکا واتە کەسێکی لەهەر جۆگەیەك ئاو بخواتەوە تامی سوێر بوو با بزانێ ئەمە خوێناوی فرمێسکی منە یا خوێناوی منەو هەر شوێنێکی دیان سوورە ئەویش هەر فرمێسکی خوێناوی منە یا خوێنی منە وا سووری کردووە، کەچی لەم مەعنایە لایانداوەو بێ لێکدانەوەی‌ئەمە کە خاك تامناکرێ بەڵام دەبیندرێو ئاویش تامدەکرێو مەعنایان وا لێداوەتەوە کە هەر جێگەیێك تامی سوێربێ ئەوە خوێناوی منە بەسەریدا ڕژاوەو سوێری کردووەو هەر ئاوی جۆگەییێکیش سووربێ دیسان خوێناوی منە بە ڕاستی زۆر دوورە ئەوجار ئەو تێکستەی دوکتۆر هەڵیبژاردوە باشترە چونکە جۆگەو قەراخ جۆگە مولازیمی یەکترین واتە لە هەر شوێنی جۆگە بوو.

# بیرەوەریەکانم لەگەڵ شەهید عەبدولخالیق مەعروفدا



جەوهەر کرمانج

بەرلەوەی لە نزیکەوە ئاشنایەتی لەگەڵ عەبدولخالیقی نەمردا پەیدابکەم. ناوبانگم بیستبوو ئەویش زیاتر بەهۆی شارەزاییو پسپۆڕی لە بواری ڕادیۆدا. کە لەوان ساڵاندا ناوبانگی پێوەدەرکردبوو. یەکەمین دیدەنیم لەگەڵ ئەودا دەگەڕێتەوە بۆ مانگی چواری ساڵی 1974، ئەو ساڵەی کە ڕێکەوتنەکەی یازدەی ئادار بە بنبەست گەیشت و زۆربەی زۆری نووسەرو ڕووناکبیرانی کورد پەیوەندییان بە ڕیزی شۆڕشەوە کرد، من لەگەڵ چەند برادەرێکی تر لە "دار السلام"ی چۆمان لە بەشی ڕاگەیاندن گیرساینەوە، هێندێکیشیان کەوتنە ئێزگە، کە لە نێوان چۆمان و دەربەند بوو، بە هۆی هاموشۆی یەکتر سەردانی بەردەوامامان هەبوو بۆ لای یەك، لە یەکێ لەو سەردانانەم بۆ لای برادەرانی ئێزگە، بۆ یەکەم جار چاوم بە شەهید عەبدولخالق کەوت و لەو ڕۆژەوە ئاشنایەتیمان پەیداکرد، ناوەناوە دەرفەتی ئەوەمان دەبوو پێکەوە دانیشین و گوێمان لە قسە خۆشەکانیو پێکەنینە شازەکەی بێ.

دوای نەمانی شۆڕش، هەریەکە بە لایەکدا پەرتەوازە بووین تا ساڵی 1977 لە هەولێر یەکترمان دیتەوە، لەو ڕۆژەوە ئیتر بەردەوام یەکترمان دەبینی، لەو سەردەمیدا ئەو زیاتر سەرقاڵی دوکانداری بوو، وەکال(هراتجدقیە)ی وەرگرتبوو، کە تایبەت بوو بە ئامێرو کەلوپەلی کارەباری و ترانسستەری ڕادیۆ، ئێواران دوکانەکەی دەبوو بە دیوەخانێکی گەورەو زۆربەی دڵسۆزان و نیشتمانپەروەرانی شاری



هەولێر لێی کۆدەبوونەوە، تەنانەت گەلێك لەوانە کاری نهێنی حیزبییان دەکردو لای ئەو ناسراوبوون، ئەودەمە ئێمە ئەندامی کۆمەڵە بووین و زۆر جار بە ڕاشکاوی قسەمان دەرهەق بە شۆڕشی نوێ دەکرد کە تازە سەریهەڵدابوو، شەهید عەبدولخالق، هەماهەنگ و هاوبیرێکی نزیکمان بوو، بێترس و سڵەمینەوە بڵاوکراوەو بەیاننامەکانمان دەدایێ، ئەوە جگە لەوەی کە وەك نووسەرێکیش قسەوباسی زۆرمان لەسەر مەسەلە ئەدەبییەکانی ئەوکاتەدا دەکرد. ساڵ هاتن و چوون، ئێمە شارمان بەجێهێشت و چووینە ڕیزی شۆڕشی نوێوە، ماوەیەك بە هۆی دووریو نەبوونی پەیوەندی ئاگامان لە یەکتر نەما، بەڵام دواتر توانیمان ئەو پەیوەندییە بژێنینەوە، بە تایبەتیش کە چەند جارێك بە نهێنی سەردانی ناوچە ڕزگارکراوەکانی کرد، بە تایبتیش بۆ مەسەلەی تەکنیکی ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان، چونکە ئەو خۆی یەکێك بوو لە شارەزاو پسپۆڕەکانی ئەو بوارەو ڕێنماییەکانی کاریگەرییەکی بەهێزیان هەبوو لەسەر بەردەوامبوون و بەهێزبوونی ڕادیۆکە.

جگە لەو دەستڕەنگینیەشی، شەهید عەبدولخالق نووسەرێکی شارەزا بوو لە ئەدەبی کوردیدا، بە تایبەتیش لە ئەدەبی کلاسیکیدا، کە یەکێك لەو کتێبە نایابانەی تێبینیو سەرنجەکانی بوو لەسەر دیوانی نالی.

شەهید عەبدولخالق، لەبەرئەوەی خوێندنی مەلایەتی تەواوکردوە و سەلیقەیەکی باشیشی لەگەڵ هەردوو زمانی عەرەبی و فارسیدا هەبوو، دیدو بۆچوونەکانی لەسەر شیعری کلاسیکیدا بە نەزەری ئیعتبار وەردەگیران، چونکە زۆربەی هەرەزۆری شاعیرانی کلاسیکی، بە تایبەتیش نالیو مەحویو ئەوانی دی سودێکی زۆریان لە بەلاغەت و تەشبیە و، تیباق و جیناسی عەرەبیدا وەرگرتبوو. هەر مەلایەتیەش بوو دواتر، دوای ئەوەی هەر مەلایەکی دیکەی کوردستان پێشنوێژی لە دێهاتەکانی کوردستاندا کردبوو و پاش هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول، چووە ڕیزی شۆڕشەوە، بەڵام لەوێ زیاتر وەك ڕووناکبیرێکی کوردو وەك تەکنیکارێك ڕۆڵی خۆی بینیوەو لە ڕادیۆی شۆڕشدا ئەرکی بەرپرسیارێتی پێسپێردراوە. یەکێك لە بیرەوەریە خۆشەکانم لەگەڵ شەهید عەبدولخالقی نەمردا، دوای هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلول و گەڕانەوەمان بۆ هەولێر، ئەو بە حوکمی ئەوەی کە پێشتر (ئیمام تابوور) لە سەربازیداو ڕوتبەی ئەفسەری هەبوو، حکومەت داوایان لێکردبوو کە دەبێ وەك ئەفسەرە ئیحتیاتەکان بگەڕێتەوە بۆ سەربازی، ساڵی 1982 بوو، گفتوگۆ لەگەڵ میری لە ئارادابوو، ئێمەش بە سەردان چووینەوە بۆ هەولێرو لە یانەی ئازادیدا لەگەڵ شەهیدان نوری نانەکەلیو عوسمان سەرسۆرو د. نافیع ئاکرەیی، یادیان بەخێر، دانیشتبووین کاتێکمان زانی شەهید عەبدولخالق بەژوورکەوت، پێشتریش دەمانزانی کە لە لایەن دەزگا ئەمنیەکانەوە بانگرابوو، هەر کە دانیشت یەکسەر لێمانپرسی: ها چیت کرد؟ وەك هەمیشەی بە پێکەنینە سیحراویەکەیەوە گوتی: واو وایان لێدەکەم، پێمگوتن باشە دەگەڕێمەوە بۆ ئیمام تابووری، بەڵام بایەك شتتان پێ بڵێم بەو خوایە بە جلوبەرگی ئیمام تابوورییەوە لە یانەکان دادەنیشم دەزانم ئێوەش ئەمەتان پێ قەبووڵ ناکرێ.. گوتی: پێیان گوتم، هەستە بابە هەستە بچۆوە سەر کارەکەی خۆت..!

شەهید عەبدولخالق وێڕای خەمەکانی بۆ مەسەلەی نەتەوایەتیو سەرگەرمی بۆ ئەدەبی کوردیو وردەکارییەکانی تەکنیکی ڕادیۆو ئانتێن، یەکێك بوو لە داکۆکیکەرە هەرە دیارو ئازاکانی مافی ژنان، کە سەرەنجام هەر ئەوەش بووە مایەی تیرۆرکردنیو شەهیدبوونی. ئافرەت لە کۆمەڵی کوردەواریدا، یان ڕاستتر بڵێین ئافرەت لە سایەی ئیسلامدا، کە ئەوە ناونیشانە ڕاستەقینەکەی کتێبەکەی بوو، بەڵام دواتر بەهەر هۆیەکەوە بووبێ گۆڕی کەچی هەر دادی نەداو بە فیتی هێندێ کۆلکە مەلای کلك گرێدراو بە دامو دەزگاکانی ڕژێمەوە لە نزیك ماڵەکەی خۆیدا درایە بەر دەستڕێژی گوللەو بە نوێژی نیوەڕۆ شەهیدکرا.

ئەو ڕۆژەی شەهیدکرا، بۆ ڕۆژی دواتر لە ڕێگای کاك فاروق جەمیلی پارێزەرەوە کە هێشتا نەهاتبووە ناو شۆڕش و نەببوو بە پێشمەرگە، هەواڵەکەمان پێگەیشت، ئەوسا بارەگای سەرکردایەتی لە ئاوەژێو سێروان بوو، بارەگای یەکێتی نووسەرانی کوردستانیش لە "مەرگە" بوو، هەر هەمووومان بە دڵساردییەوە کۆبووینەوەو تەکبیری ئەوەمان کرد چۆن بە "پشکۆ"ی کوڕی بڵێین باوکت شەهیدکراوە، دواجار بە ڕاوێژ لەگەڵ کاك مولازم عومەر بڕیارماندا پێشتر جەنابی مام جەلال ئاگاداربکەینەوەو هەر ئەویش تەکلیف بکەین بە "پشکۆ" بڵێ، ئەوەبوو لە بارەگای تایبەتی هەڤاڵ مام جەلال کۆبوینەوەو کاك پشکۆش بانگرا بۆ ئەوێ، بە بیرمە سەرەتا ڕاسەوخۆ پێی نەگوترا باوکت شەهیدکراوە، بەڵکو گوترا تەقەی لێکراوەو بە خەستی بریندارە، بەڵام ئەو خۆی تێگەیی کە نەماوەو بە قوڕگی پڕ گریانەوە ڕوویکردە جەنابی مام جەلال و گوتی: تکام وایە خوێنی بزرنەکرێ..! ئینجا مام جەلال هەواڵی شەهیدکرانەکەی پێ ڕاگەیاندو بەڵێنیشی دا کە دەقات تۆڵەی بکرێتەوە، هەر لەوێش یادی چلەی کرایەوەو مام جەلال وتەیەکی بەو بۆنەوە پێشکەشکردو داوتریش وتاری یەکێتی نووسەرانی کوردستان و هەردوو شیعرەکەی کاك شێرکۆ بێکەس و من خوێندرانەوە.



# پرسیارێك لە گۆڤارە وێكچووە/ دژبەیەكەكان

# و

# سڵاوێك لە جەستەی ڕەشەكوژیكراوی عبدالخالق مەعروف و كتێبەكەی

نووسینی: هەندرێن



"ئێمە پێویستمان بە میتۆدێك هەیە كە ئاستەنگەكانمان بۆ بەدیاربخاتو جیاوازییەكان بخوڵقێنێو زمانێكشیمان بۆ بەرهەمبێنێ".
ژیل دولۆز

لە ڕۆژگارێكی وەك ئەمڕۆ، كە خەریكە بابەتە گوتراوو نەگوتراوەكان گرنگی پێوانەكردنیان بەسەردەچێ، ماسمێدیا بە باڵادەستی خۆی دەتوانێ یاری بە تەواوی كێشە خۆیەتیو گشتییەكان بكات، جیاوازی سنوورەكانی نێوان ڕاستیو هەڵە؛ مەرگی نوێنەرایەتیكردنی هەقیقەتەكان فەرامۆشدەكرێ، گفتوگۆی قەیرانی ئاوابوونی "داستانە مەزنەكان" و ڕاگەیاندنی نەمانی ئۆرگینالییەتی فیكریو فەلسەفەش تا دێ ڕاشكاوتر دەبێ. لەم ڕوانگەیەوە بێدەنگبوون لە كرداری ڕەشەكوژیكردنی نووسەری خاوەن هەڵوێستو كردار، لە كۆمەڵگای ئیسلامی بە گشتیو كورد بە تایبەتی، ڕووناكبیریی كوردیو گۆڤارە بە چەمكە قورسە سیخناخكراوەكانیان بەرەو ڕووی پرسیارێكی بارگران دەكاتەوە: ئاخۆ باشتر نییە، لەبری ئەو پێشبڕكێیەی كە گۆڤارەكانیان تەرخانكردووە بۆ نووسینگەلێكی پڕ لە چەمكو دیاردە مانا ڕەگ بڵاوەكانی ڕۆژئاواییو ڕووكەش بەكارهێنراوەكانی كوردییانە، هەریەك لەو "هەموو" گۆڤارانە بەشێكی دیاریكراو لەو بابەتو دیاردە كۆمەڵایەتی، سیاسی، ئایینی، ئەخلاقیو ئابوورییانە بكەنە پرسیارێكی تایبەتمەندی گۆڤارەكانیان، كە بەرهەمهێنانەوەی لە كۆمەڵگەی كوردیو بە تایبەتیش لە ژێر سایەی "حوكمەتی هەرێمی كوردستان"دا "ڕەگێكی بەربڵاو"ی هەیە، كە وا ئەمڕۆ خەریكە جەستەی كوردی بە "تراژیدیا"یەكانیشیەوە بۆگەن دەكەن؟

ئەو بارودۆخە ئاڵۆزكاوە، لە ئاستی كۆمەڵایەتیو دەروونیدا، پاش ڕماڵینی دامودەزگا مرۆڤكوژەكانی ڕژێمی سەددام كاریگەرانەتر دەبینرێ، چونكو لە كوردستانی خوارووودا خەڵكی كورد خۆی لە بەردەم پرۆسێسێكی تازەدا بینیەوە، كە هێشتا سەرەنجامەكەی بۆ ئێمە لە چاوەڕوانی وەڵامو هەڵسەنگاندنێكی بڕوائامێز ماوەتەوە. هەڵەتەبوونو سەرلێشێوانو دەستكورتی ئەم پرۆسەیە، كۆمەڵی كوردی لە هێزی ناوەكی خۆی نامۆكرد، كە خودی ئەم هێزەش بوو هانیدا دەسەڵاتێكی ستەمگەر ڕەتبكاتەوە

تاوەكو بوونی خۆی لە جیهانی بێبشەكراویدا ئاشكرا بكات. لە خۆنامۆبوونی كورد، لە ئەنجامی سەرمەستبوونی ساویلكەییو دەستەپاچەیی نوێنەرە سیاسییەكانی بە پشتیوانی هێزە دەرەكییەكان، كە لە بنەڕەتدا سەرەتای نیشاندانی ئەم پشتیوانیكردنەی هێزە دەرەكییەكان لەم نوێنەرانە، بۆ بەرهەمی هێزە ناوەكییەكەی ئەم كۆمەڵە دەگەڕێتەوە. كەچی ئەم نوێنەرانە، لەبری سەقامگیركردنی مافە ڕەواكانی ئەم كۆمەڵە، پاداشتی شەوكوێریو لێكترازانی هێزی ناوەكی جەستە زامدارەكەی بەخشی، دواجاریش فەرامۆشكردنی ئەم كۆمەڵە لە هێزە ناوەكییەكانی، گەیاندیە ئەو ڕادەیەی كە دەستەهەڵبێنێ لە بەردەم قەدەری بێمانابوونی ژیانو ئارەزووی گەڕان بە دوای خۆدۆزینەوەو ئامادەبوونی لەسەر زەویدا. ئەم داچڵەكانەی كۆمەڵگەی كوردی لە ئاستی كۆمەڵایەتیدا دیاردەگەلێكی بەرهەمهێنا، كە لێرەدا بۆ كورتكردنەوە تەنیا دەتوانین بە دیاردەی چاولێكەری حوكمڕانە ستەمگەرەكانی دنیای سێیەم ناودێری بكەین، كە خۆی لەمدیوی دەمامكی ئیسلامگەری شاردۆتەوە. تیۆرییو ڕەفتارەكانی ئەم دیاردە ترسناكە بە بیانوی پاراستنی بەهایەكانی ئیسلامو ڕەوشتی چاك، لە پێناوی ئەمەدا ڕەوایەتی بەخۆی دەدا، لە جیاتی پەیڕەوكردنی پەیوەندیو گفتوگۆی هەمەلایەنی یەكسان، میتۆدی: ڕەشەكوژیكردنی ڕوحی هاوچەرخ، هەڕەشەكردن لە ئازادی بیركردنەوە، هەتككردنی جەستەی ژن، وێرانكردنی لایەنە ڕۆشنەكانی ژیانی خەڵك؛ واتا ڕێگەگرتن لە بیركردنەوەی جیاوازو توانای بڕواكردن بە هێزی ناوەكی خودی خۆی.. تاد، پەیڕەودەكات.

لەبەرئەمە بێدەنگبوون لەم دیاردەو بیرنەكردنەوانە بۆ خۆشكردنی زەمینەیەكی فراوان كە بە ڕێگەی میتۆدگەلێكی هەمەلایەنەوە دەرفەتی ئەوە بدات، هزرە جیاوازو هەڵەسنگاندنەكان بخوێنرێنەوە، تەنیا مانای نەبوونی ڕوناكبیر، یان بوونیمشەخۆری ڕوناكبیریی سەرتاسەری لەم كۆمەڵگەیەدا بە ئێمە ڕادەگەیەنێ. ئەمڕۆ ئەم بوحرانی ڕوناكبیرییە چ لە كوردستانو چ لە دەرەوەدا، بێئەوەی نیازم بە گشتیكردنی ئەم ناولێنانە، یان لەكەداركردنی خودی كەسەكان بێت، بوونی خۆی بەرانبەر پرسیارێكی گومانكارو شەرمهێن دەكاتەوە، كە تەنیا بە بنیاتنانەوەی خودی خۆی دەتوانێ وەرامی بداتەوە.

لەم ڕۆژگارەدا، ڕۆشنبیریی ئێمە لە هەندەرانو ناوەوەن لە هەموو كاتێكی تر زیاتر ڕووبەڕووی ئەم ڕووداوە تراژیدییانە دەبێتەوە، بێ ئەوەی بەرتەكێكی كاریگەرانە ئەنجامبدات، كەچی سەرباری ئەمەش، مانگانە دەیان كتێبو گۆڤارو ڕۆژنامەی بەرخۆر "ئیستهلاكی" بڵاودەكرێتەوە. لەوەش زیاتر یەكێك لەو گۆڤارانەی كە لە سوێد دەردەچێ، كە بەرپرسیارەكانی دژی گشت ئەو نووسینە كوردییە تازانەیە كە سەرچاوەكانیان لە هزری "پۆستمۆدێرنیستەكان"ەوە هەڵدەقوڵێ، كەچی بە درەنگییەوە، بۆ بردنەوەی ئەم "پێشبڕكێ"یە بە ڕێگەی سەرچاوە عەرەبییەكانەوە فێری "پۆستمۆدێرنیزم"مان دەكەن. هۆی زۆریو بۆری ئەم بڵاوكردنەوە بێ پرۆژەو میتۆدییانە تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ قەرەبوكردنی ئەو بۆشاییە گەورەو خۆدزینەوە لەو دەستەپاچەییەی، كە ڕوناكبیریی كورد لە بەردەم پرسیاری داهێناندا ڕووبەڕووی دەبێتەوە. بۆیە دەبینین، بەشێكی زۆری نووسینەكانی سەر لاپەڕەكانی گۆڤارو ڕۆژنامەكانی ئێمە لەم قۆناغەدا، هاندەریی هەمان ئامانجی ئەو واقیعە شەڕانییە خۆكوژیەی وەرگرتووە، كە سیاسەتمەدارەكانی كورد چارەنووسی كۆمەڵەكەمانی تیادا هەڵخەڵەتاندووە. بەمجۆرە دەبینین نووسینیش خەسڵەتی چەكی پۆشیوە لە پێناوی سڕینەوەی جەستەی ئەویترو هێرشكردن بۆ سەر ئەم نووسەرو ئەو نووسەر، بێ لە گۆڕیدابوونی هیچ یاساو ئسوڵێكی جێگیر، كە نووسەر بۆ پارێزگاری مافی خۆی بتوانێ ڕووی لێبكات، ئیفلیجی كۆدە مەعریفییە زانستیو میكانیزمەكانی بیركردنەوەو میتۆدەكانی بیانوكاری لە پانتایی ڕۆشنبیریی ئێمەدا، كەشێكی نالەباری ئەوتۆی دروستكردووە، كە گرینگدان بە لێكۆڵینەوە لە لایەنە سۆسیۆلۆژی، كێشە دەروونییەكان، هۆكاری سەرهەڵدانی كتوپڕی ئایین، میتۆدە شكستهێنەرەكانی سیاسەتمەدارو بنەچەی دنیابینی كولتووری ئێمە پشتگوێبخرێت. ئەمڕۆ ئەركی نووسەر ئەوەیە ئەو بارە كەنەفتو چەقبەستووەی كە مێشك و زەینمانی داخستووە، تەكانپێبداو بارێكی بزوێنەرو بەرهەڵدراو بخووڵقێنێ، كە بتوانین بە میكانیزمی جیاوازی بیروڕا دەربڕینو بە پاڵپشتی بەڵگەو ڕەخنەو بیانوكاریی، لەسەر ئاستی گیروگرفتەكاندا دیالۆگێكی بەرانبەری بخوڵقێنین.

لەم كاتەی ئەو دیاردەی، كە ناومانبرد ئاییندەمان بە هەڕەشەوە گەمارۆدەدا، كەچی گۆڤارە قەبەو تژی لە بانگەشەی ئەو زاراوەو چەمكانە زۆرتر دەبن. هاوكاتیش پەرەدۆكسیو ناشازی ئەو زاراوەو چەمكانە، بە هیچ پێوانەیەكی كوردیو غەیرە كوردی لەگەڵ "بەڕێوەبەر" و "سەرنووسەر" و "خاوەن ئیمتیاز"ەكانیان، مەهانەهێنانەوە قبووڵناكات.

چۆن دەكرێ سەرنووسەرێك، یان هەریەكێك لەم گۆڤارانە، بەڕێوەبەرو نووسەرە تایبەتییەكانیان ئەندامی یەكێك لەم حیزبە خەمهێنەرانە بێت، یان مشەخۆرێك بێت؛ لە ئەورووپا، كورد واتەنی پولی "سۆسیال- ماڵی مامە- وەربگرێ، كەچی لە كوردستانیش بە ڕێگەی "كادیرە حیزبییو ڕوناكبیر"ەكەی هاوڕێی یان خزمەكەی ببێتە سەرنووسەرێكی، بێلایەقی یەكێك لەو گۆڤارە وێكچووە دژبەیەكەكان، لەو كاتەی دەیان منداڵی كورد بە نەخۆشیو هەتیوی، یان لەبەر دەسكورتی دایكو باوكی، لە چلەی زستانو لەبەر قرچەی گەرمادا، لە جیاتی خوێندنو یاری منداڵانە تا شەو ناچاری دەكا بەرەو ماڵ بێتەوە سواڵبكا، یان پێڵاوی ئەفەندییەكان بۆیاغ بكات.. تاد؟! لە كۆتاییدا دەكرێ بێژین: چۆن

نووسەرێكی دڵ پڕ لە ڕق وو كینە، دەتوانێ بیر لە بەهای جوانی ژیانی كەسەكان بكاتەوە، یان ڕێز لە جیاوازی بیركردنەوەی تاكەكەسەكانی كۆمەڵ بنێ، نووسینێك بنووسێ، كە لەو هزرڤان و ئەم فەیلەسوفە، لەو گۆڤار ئەم ڕۆژنامەیە، بێكار لەگەڵ كردن، دەسكەنەی كردبێ، هاوكاتیش دەیان سەرچاوەو ناو لەژێر دێڕی "سەرچاوەكان"ی پشتەوەی وتارەكەی ڕیزدەكا، كە ئەم تەرزە نووسینەن نەك لە جەهەری خۆی ناوەشێتەوە، بەڵكە دژی خۆشیەتی، جا بە خێرایی بۆ یەكێك لەم گۆڤارە گەڕەلاوژە ئامێزانە بنێرێت، كە "ناونیشانەكە"ی وای لێدەكات بەوە شادبێت كە بەم بابەتە پێشی گۆڤارەكەی تر دەداتەوە؟ وێجا بە بڵاوكردنەوەی ئەم جۆرە بابەتانە، نووسەری "خاوەن فیكری خۆماڵی كوردی" بە ئێمەی خوێنەری كوردی بێئاگا دەڵێ: "كەس لە پێش مندا بە زمانی كوردی باسی لەو چەشنە مەعریفە تازانە نەكردووە"!

لێرەدا دەمانەوێ بڵێین ئێمە كاتێك دەتوانین باس لە مەعریفەی تازە بكەین و بە گۆڤارەكانمان تایبەتمەندی ناوەڕۆكەكانی بسەپێنێ و لەوێكچووە/ دژبەیەكەكانەوە، بەرەو جیاوازییە تەبایەكان، كاتێ توانیمان بە هۆی ئەو هزرو چەمك و دیاردە میتۆدیكانەی پرسیارو بوحرانە ڕەگاژۆكانی كۆمەڵەكەمان ڕاڤەبكەین، دواجاریش ئێمە ئەوكاتە دەتوانین لە بزاوە فیكرییەكاندا باس لە "منی ئامادە" بكەین كە توانیمان بە بەرهەمە "تازەگەرو پاشتازەگەر"ەكانمان ڕەهەندگەلێكی تر بەو هزرو چەمك و دیاردە مەعریفییە خوازراوانە ببەخشین. هاوكات بە پێچەوانەی ئەمەشەوە، ئێمە كاتێك دەتوانین باس لە "تازەگەری"و "پاشتازەگەری"و دیاردەی ئیدیالە بڕواداریيەكانی "ئیسلامگەری"ی كوردی بكەین، كە بە مەعریفەیەكی تیۆریی، یان ئاینی تازەی "كوردیزا"یانە، ئەو دیاردەی هزرو چەمك و فەلسەفانەی ڕۆژئاوای خاوەن دوو هەزار ساڵ زێتری فەلسەفەو داهێنەری "یارییە دوالیزمەكان" بخوێنینەوە. تێڕوانینی ئەو یارییانەش میكانیزمەكەی: لە سۆبێكت و ئۆبێكت؛ منی داهێنەری ڕاستیەكان و "ئەویدیكە"ی خنكاو لە هەڵەو سیما دزێوەكان؛ خاوەن بەرهەمە فیكریی و تەكنیكە بەهایەدارەكان و ڕزگاركەریی مرۆڤایەتی لە جیهانی نەزانی.. تاد، سەرچاوە هەڵدەگرێ.

بەهەرحاڵ، بۆ ئەوەی بۆ ساتێكیش بێت بتوانین ئەو بارە قورسە لەسەر شانمان سووكەڵە بكەین، كە ئەو دێڕانەی سەرێ خستییە سەر ئەستۆمان، دەمانەوێ درێژەی ئەم نووسینە ببێتە سڵاوێك، كە لە بنەچەدا، بۆ بەیادهێنانەوەی، عەبدولخالق مەعروف و كتێبە ڕەشەكوژێكراوەكەی: ئادەمیزاد لە كۆمەڵی كوردەواریدا، تەرخانكرابوو.

دواجاریش ئەم نووسینەی كە ئێستا بەم تەرزە دەبینرێ، ناوەڕۆكەكەی لە ساڵی 1996 بۆ پێشەكی چاپێكی تازەی كتێبی ناوبراو نووسرابوو، كە خاوەن "چاپخانۆكەیەك" داوای پەیمانی ئەم چاپكردنەوەی پێدابووم. بەڵام دوای ماوەیەك ئەم پەیمانە لەبەر "مەترسی" ئەم كتێبە هەڵوەشایەوە. بەڵام، لەبەر ڕێزلێنانی كتێب و نووسەرەكەی، ئەم نووسینەم بۆ بڵاوكردنەوە پێشنیازی گۆڤارێكی كوردی كرد كە لە سوێد چاپدەكرێ، كەچی "سەرنووسەر"ەكەی، بەرلەوەی تێكستەكە بخوێنێتەوە، "ئازادی" بیروڕاو ڕێزگرتن لە "ترس" ناچاری كرد، بە پەلەپرۆزێ بڵێ: "كاكە ئێستا بڵاوكردنەوەی ئەم نووسینە باش نییە!"

لە بیرمان نەچێ ئەم كتێبەی عەبدولخالق مەعروف یەكێكە لەو ڕاڤە باشە كوردییانەی كە دەبوو ببوایە بە یەكێك لەو سەرچاوە خۆماڵیانەی ئێمە كە گۆڤارە كوردیەكان، وەك سەرچاوەیەك ئەم دۆخە نالەبارەی ئێستای كۆمەڵگەی كوردیان بخوێندایەتەوە.

2

بەڵێ، وا نزیكەی چارەكە سەدەیەك بەسەر جەستەی ڕەشەكوژێكراوی عەبدولخالق مەعروف و كتێبەكەی: ئادەمیزاد لە كۆمەڵگەی كوردەواریدا، تێدەپەڕێت. ئەم بارودۆخەی ئێستا، كە ئێمە تێیدا سڵاوێك لەو كتێبە دەكەین، گەلێ تاریكترە لەو ڕۆژگارەی كە بوو بە بابەتی كتێبە سۆسیۆلۆژییانەكەی نووسەرو دواجاریش، ڕەشەكوژێكردنی نووسەرو تابۆكردنی كتێبەی، بە هۆی هێزی جێلەقكردنی ئەو تێڕوانینە بەستەڵۆكانەی كە بێ بەرپرسیاریی نوێنەری ئایینی ئیسلام دەكەن.

كتێبی ناوبراو وەك سەرەتایەك، هەوڵێك، بە ڕێگەی جۆرە میكانیزمێكی بزوێنەر، كە لە پانتایی ژیانی ڕۆشنبیریی ئێمەدا كەم ئامادەیە، لایەنێك لە پێكهاتەی جەستەی كۆمەڵی كوردەواری، كە ئاینی ئیسلامەو ڕۆڵێكی گرنگ و ئامادەییەكی تەواوی لەسەر عەقڵ و ئاگایی و دەروونماندا هەیە ڕۆشندەكانەوە. لە بەرانبەر ئەم كارە جوامێرو بەجەرگە جیاوازەدا، تاقمێكی بكوژ، بە پاڵشتی ڕژێمی سەددام، كاك عەبدولخالق مەعروف و كتێبەكەی ڕەشەكوژ دەكەن. ئەوە ڕووداوێكی تازە نیە كە بۆ یەكەمجار لە دنیای جەنجاڵی خۆرهەڵاتدا ڕوویدابێ.

ڕژێمە دیكتاتۆرو گروپە تۆتالیتارەكان هەمیشە ئاینی ئیسلامیان وەك مەهانەیەك بۆ بەرژەوەندی دیماگۆگیانەیان قۆزتۆتەوەو جەستەی نووسەرو كەسانی بوێریان سڕیوەتەوە. بەم چەشنە ئەوە بۆ جارێكی تر، ئەو تاقمە نەزانە بە مەهانەی داكۆكیكردن لە ئاینی ئیسلام و ختوكەدانی هەستی ساویلكەی ئاینزای جەماوەر، پاداشتی جەستە لەناوبردن بە عەبدولخالق مەعروف و كتێبەكەشی دەبەخشێ.

ئا لێرەدا، ئەم هەوڵە سادەیەی ئێمە تەنیا ڕێزلێنانێكی سادەو بەیادهێنانەوەی ئەم نووسەرە جوامێرەو كتێبە فەرامۆشكراوەكەیەتی.

لە دیدگەی ئەم هەڵوێستەوە، دەكرێ ڕێزی ئەم هەوڵەی عەبدولخالق مەعروف، وەك نووسەرێكی كورد، لە ئاستی ڕێزو

بەهای نووسەرانی عەرەبی وەك: حسين مروه، مهدی عامل، دكتۆر فرج فودەو هونەرمەندو ڕوناكبیرانی تری دونیا بنرخێنین، كە بە مەهانەی كوفرو مولحیدو خەتەرناك، گێرەشێوێن و خائین، خڵەفاوو مرۆڤكوژەكان، بە ناشیرینترین و نامرۆڤانەترین شێوە ڕەشەكوژیان كردوون. مامەڵەكردن بەو جۆرە بێ ڕێزییە، نەك لەگەڵ بەهاو مانای سەردەم ناگونجێ، بگرە هەتا لەگەڵ ناوەڕۆكی خودی ئاینی ئیسلامیش یەكناگرێتەوە. بەو مانایەی كە سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلام، خۆی لە خۆیدا، سەرهەڵدانی ڕزگاركردنی كۆمەڵ بوو لە خورافەت و بێدادی كۆمەڵایەتی، لەوانە پاراستنی مافی ژن بوو لە زیندەبەچاڵنەكردنی بە كۆمەڵی، دواجاریش ئیسلام وەك وەرچەرخانێكی كولتووری، كە بە ڕۆشنگەری عەرەب، یان ڕۆژهەڵات، ناودەبرێت، توانی لە پاڵ بەرهەمهێنانی هزرڤانانی وەك: ابن الرشد، ابن سينا، ابن الخلدون، فارابی و ابن العربی، زانستگەلێكی مرۆڤایەتییانەی وەك: دەرمانسازی، ئەستێرەناسی و ماتماتیك و.. تاد بە دونیا ببەخشێت. لێرەدا مەبەستمان دروستكردنی پێوانەی بەراوردكاری نییە، بەڵكە پیشاندانی جیاوازییەكانی ئەم ئایینەیە، كە بڕێك لە پەیڕەوكارانی، لە بری ڕۆشنكردنەوەو پەرەپێدانی ئەو مێژووەو هۆشیاركردنەوەی كۆمەڵ، دونیایەكی خامۆش وێڵدەكەن. نەهامەتی و ڕەشبگیری و داچڵەكاندن لە ڕۆژگارێكدا، كە مرۆڤایەتی گەیشتە ئەوپەڕی زانست و تاقیكردنەوەی عەقڵی ئادەمیزاد، كەچی لە كۆمەڵگەی ئێمە بە مەرگ خورافەت، درۆو ڕیا داگرتووە، مرۆڤ لەسەر سادەترین وشە، كە جیاوازبێ لەگەڵ داب و نەریتی كۆمەڵگەو دامودەزگاكانی ڕژێمە دیكتاتۆرەكان، لە جیاتی دیالۆگ و لێپرسینەوەو دادگا، بێمافی داكۆكی لەخۆكردن، جەستەی تەفروتوون دەكرێ! كارێكی چەند ئەستەمە قبووڵكردن و پشتگوێخستنی ئەو واقیعە دڕندانەیە! كارێكی چەند پووچ و گەندەڵە، كە لەناو ئەو واقیعە تاڵەدا، ڕوناكبیر بانگەشەی ماف و ئازادی ژن بكات، لەوكاتەی كە خودی ئەم ڕوناكبیرە لە ناخیدا بەسەر كەسانی دەوروبەری خۆیدا؛ خوشك و ژن و منداڵەكانی، بە جۆرێك هەمان ڕەفتاری كۆنترۆڵكردن و قەدەغەكردن، بەناوی داب و نەریتی ئیسلامەوە، پەیڕەو دەكا!

بەردەوامبوون و كەڵەكەبوونی ئەو واقیعە تۆتالیتاریستە، هاوكات لە خۆماندا ئاگاربین، یان نەبین، دەمانكاتە نووسەری دیكتاتۆر، دەسەڵاتخوازی تۆتالیتارو مرۆڤی شێواو.

ئا لێرەدا، عەبدولخالق مەعروف لە كتێبی، (ئادەمیزاد لە كۆمەڵی كوردەواریدا)، وەك وتم لە هەوڵە سادەكەیدا، ئەو هەقیقەتە دیزەبەدەرخۆنەكراوە لە لایەن نووسەرانی بە قسە، تەنیا "بە قسەكردن و بانگەشە" نەك بە كردارو مامەڵە/ ئاشكرا دەكاو ئەو پێكهاتە وێكچووە/ دژیەكە؛ بانگەشەی بەدەم بۆ یەكسانی و ئازادكردنی ژن، بەڵام لە كردارو عەقڵدا بە پێچەوانەوە، پەردە لەسەر هەڵدەماڵێ.

وێڕای ئەمانەش ئەم كتێبە بەرەو ڕووی پرسیارێكمان دەكاتەوە، كە هەر هەمووومان دەگرێتەوە. ئەویش ئەو بیرو چەمكانەیە كە لە دەرەوەی خۆمان بە كۆپیەكی هەرسنەكراو خواستووومانە. بیروباوەڕێك كە هی ڕۆژئاوایە، ڕۆژئاوایەك كە دەمێكە نەك هەر بە قسە ئەو بیرو بۆچوونانەی ڕاگەیاندووە، بەڵكو بە ڕێگەی ئەو بیروباوەڕو چەمكانەوە ئێمەی ملكەچكردووە. ئەم كارەش ئێمەی لە بارێكی پەرەدۆكسدا گیرخواردوو كردووە. بۆ نموونە: ئاخۆ ئێمە دەتوانین لە كرداری ڕۆژانەماندا لەگەڵ ژن و خوشك و دایك و ژنانی نزیك بەخۆمان، ئەو بانگەشەكردنەی كە بۆ ژنان لە نووسینەكانماندا دەیكەین، بە كردەوە ئەنجامیبدەین؟ ئاخۆ لەگەڵ خودی خۆشماندا كاتێ لە نووسیندا باسی مافی مرۆڤ و ئازادی دەربڕین و یەكسانی و بەرانبەری ژن لەگەڵ پیاودا دەیكەین، هەست بە ناڕاستی و دژایەتیكردنی ئەو بانگەشەو داواكاریانە ناكەین؟ یان با زیاتر لە واقیعی ئەمڕۆ نزیكببینەوە، ئەویش: ئاخۆ ئەمڕۆ ئەو نووسەرانەی كە چەند ساڵ لە ئەورووپا تاقیكردنەوەیان هەیەو لە نزیكەوە ئەو واقیعەیان دیوە، هاوكات لە ڕابردوودا خەونیان بەو واقیعەیان دیوە، كە بە نووسین باسیانكردووە، ئێستا دوای دیتنی ئەو واقیعە، بۆ دەچنەوە لە كوردستان كیژێك لەگەڵ خۆیان دەهێننەوە ئێرە، بەبێ ئەوەی هیچ لایەنێكی یەكسانی و ئازادی لەو مارەكردن هێنانەدا ڕۆڵی هەبێ، تەنانەت خۆشیان دەزانن ئەوە ڕۆڵی لە ئەورووپا بوون و كۆیلەیی ژنانە لە بەردەم پیاودا كە بەوە ڕازیاندەكا؟ ئەوە باسی ئەو كەسە ئاساییانە هەر ناكەین كە بەو كارە هەڵدەستن. ئاخۆ مانەوەو درێژەدانی ئەو بارە، ئەوە دیدو بۆچوونی ئایینی ئیسلام نییە، كە لە قوولایی دڵ و دەروون و عەقڵماندا دەسەڵاتێكی ڕەهامان لەسەر دادەنێ؟

بە ڕاڤەكردنی ئەم پرسیارو كێشانە، كتێبی ئادەمیزاد لە كۆمەڵی كوردەواریدا، وێنەیەكی ئاڵۆزو شاراوەی كۆمەڵگەی كوردمان پێشكەشدەكا، كە دیاردە سۆسیۆلۆژییەكان لە پشت بەرهەمهێنانیەوەیەتی.

بۆیە نابێ ئەم كتێبە، وەك ئەو جۆرە وتارو ڕاپۆرت و نووسینە لاساییەكەرەوە پڕ لە چەمكە ناوێزانە بخوێنینەوە. چونكو ئەو نووسینە وەرگێراوو تەرجەمەكراوانە، بەمجۆرەی كە بەردەوامە، لە چەواشەكردنی سەرچاوەی ئەو چەمكانەو بریندراكردنی سەرچاوەی ئەو چەمكانەو بریندراكردنی هەستی بڕواداران بە ئیسلام و هەرزەگویی بترازێ، هیچی تر ئەنجامنادەن. ئەو جۆرە نووسینانەی كە دوورن لە هیچ ئیزافەیەكی "تازەگەری- پاش تازەگەرییانە، ناتوانن ئەو بارە نالەبارە كۆمەڵەكەمان جێلەق بكەن. هاندەری ئەو تەرزە نووسینانە، نەك تەنیا لەو ئایدۆلۆژییە هەرسنەكراوانە نزیكن كە چاویان كۆمەڵ نابینێت، بەڵكە لەو خاكەش بەنامۆكراون كە بەرهەمهێنەری ناوەڕۆكەكانییەتی، ئەو چەشنە نووسینانە ئیدۆلۆژیایەكی تر، یان ئاینێكی ترە، بەڵام بەو

چەمکانە دەمامکدراوە، کە لەبەر بێهێزیو ئەبڵەقبوونمان بەرانبەریان، دەتوانن بە ئاسانی فریومانبدەن. بە ڕەواجبوونی ئەو جۆرە نووسینە بێبنجو بنەمایان، بۆ تێڕوانینە ڕەهاو بە زۆرەملێیانەی ئەو بڕوادارە "تازانە"ی بزاوی ئیسلامگەریی دەگەڕێنەوە. ئەنجامی ئەو نووسینانە، بەرهەمێکی لەم جۆرە کتێبەی عەبدولخالق مەعروفیش دەخاتە ناو ئەو بارە سەختو گشتگرەوە.

لە ڕاستیدا ئەوەی ئەم کتێبە ئەنجامیداوە، تەنیا خوێندنەوەی ئەو ئایەتو حەدیسانەیە کە لە قورئانی پیرۆزو پێغەمبەر "د.خ" و ڕابەرانی ئیسلام کە سەبارەت بە هەموو پرسیارەکانی ژن نووسیویانەو ڕایانسپاردووە. نووسەر بەوپەڕی دڵسۆزیو ئەمانەتەوە ئەم ئایەت و حەدیسانەی وەك خۆیان یەك بەیەکە نووسیوەتەوەو بە زمانی کوردیش ڕاڤەیکردوون. هەروا سەرچاوەی هەموو ئایەتو حەدیسەکانیشی دەستنیشانکردووە. ئەو کارەی کە نووسەر لەم کتێبەدا مەبەستی بووە، تەنیا دەستنیشانکردنی ئەو بنەمایانەیە، کەلە ئایینی ئیسلامدا بەرانبەر بە ژن جێگیرکراون.

لە ڕوانگەی ئەم ئایینەوە نووسەر ئەوەمان بۆ دووپاتدەکاتەوە کە کۆمەڵگەیەك بە دڵو گیان بڕوای بەو ئاینەیەو لە بچووکترین کرداری ڕۆژانەیدا پەیڕەوی دەکا، ناکرێ نووسەران تەنیا بە نووسینەکانیان بە پێچەوانەی ئەو واقیعەوە بانگەشە بۆ تێڕوانینێکی تر بکەن، کە زەمینەی لەناو ئەم کۆمەڵگە بڕوادارەدا نییە. لەوکاتەی خودی ئەو نووسەرانە لە کرداری ڕۆژانەیاندا هەرهەمان دابو نەریت پەیڕەودەکەن، کە لەو ئایەتو حەدیسانەی ڕابەرانی ئیسلامدا باسکراون. نووسەر لە دووتوێی باسەکەیدا جاروبار ڕاستگۆیانەو بە ئاشکرا ئەوە ڕادەگەیەنێ. کە کۆمەڵگایەك بەوجۆرە، کە ئاینی ئیسلام حوکمی تەواوو موتڵەقی لەسەر بکا، ناکرێ بەو نووسینانە خۆمان فریوبدەین. بەوە داوامان لێدەکا جارێکی تر بە دیدو ڕوانینێکی قووڵو بەڵگەدار لەسەر ئەو مەسەلەیە بدوێین، ئەگەرنا هەموو هەوڵێك لە دوا ئەنجامدا زیادەڕۆییو بی نرخ دەمێنێتەوەو شوێنەوارێك لەسەر ئێمەدا بەجێناهێڵێت.

ویڕای ئەم ئەرکە بەنرخەی، کە عەبدولخالق مەعروف ئەنجامیداوە، بەڵام ئەو وەك نووسەرە "پێشەنگەکان"مان بۆ دەکاتەوە خۆی بە نوێنەرایەتیەکی "ڕاستەقینە"ی ڕۆشنبیری کوردی لە قەڵەمنادات. جاوا لە خوێنەر ناکا لە دەوروبەری کۆببنەوەو ستایشەکانی پەیڕەوبکەن. بۆ نوسینی ئەم کتێبە تێرم و فیکرو دیعایەی بیانیو نەگونجاو، وەك بانگێکی تازە ناکاتە جومگەی کتێبەکەی، تاوەکو هەقیقەتە "تازەکان" پێشکەشی کورد بکات.

هاوکاتیش وەعزو ئامۆژگاریشمان ناکا، بەڵکو هانماندەدا ئازادانە بیربکەینەوە، پرسیار بکەین، تا لە پەرەدۆکسییەت و هەلپەرستیو بانگەشەکردن خۆمان ڕزگار بکەین. دواجاریش دانبنێین بە واقیعێك کە تا قوڕگی لە تاوانو تاریکیدا، لە نەزانیو خورافەتو خێڵایەتیو غەیبانییەت نقوومبووە. واقیعێك کە بەرهەمەکەی ئەم دوو حزبو دیاردە شێواوو ئاڵۆزکاوەیە، کە دەتوانێ دەیان نووسەری وەك عەبدولخالق مەعروفو ژنی "جیاواز" هەتکبکات، بێئەوەی یاسایەك هەبێت بتوانێت داکۆکی لە مافی ژیانی جیاوازیان بکات.

لە کۆتاییدا بە ڕەوای دەزانم بڵێم: کتێبی: (ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا) یەکێکە لەو سەرچاوە بە سوودو بوێرانەی کتێبی کوردی، کە ئێمە وەك هەوڵێکی، دەڵێم وەك هەوڵێك "کتێبی وا بە سوودمان لە ناو کتێبی کوردیدا بە دەگمەن بەرچاودەکەوێ، کە بتوانێن بەمجۆرە میتۆدە بوێرانەیە لەولایەنە گرنگو بە پیرۆزکراوانەی ڕابردووی ئێمەی کوردی بکۆڵێتەوە. لە هەمان کاتدا ئەم کتێبە یەکێکە لەو خوێندنەوە سۆسیۆلۆژییانەی ئێمە، کە دوای ئەمە کتێبخانەی کوردی وێنەی لەم جۆرە کتێبەی یەکجار کەم پێشکەشکراوە. بۆیە کردنی ئەم کتێبە بە سەرچاوەیەك بێلێکۆڵینەوەو مشتومڕ سەبارەت بەو دیاردە تازانەی، کە نووسەری ناوبراو گیانی خۆی بۆ فیداکرد، ئەرکی ئەو نووسەرو ڕوناکبیرانەیە کە لە نووسینو گۆڤارەکانیانەوە، بانگەشەی ئازادی بیروڕا، تازەکردنەوە، پێکهێنانی "قەوارە"ی نەتەوایەتی کوردو مافی یەکسانی ژن دەکەن، ئاماژەی پێبدەن.

بە پراوەکردنی ئەو پرۆژەیە، گۆڤارە زۆرەکانی کوردی، بە تایبەتمەندی بابەتهەڵگریو پێویستی بوونیان، دەتوانن لە دیاردەیەکی لێکچووی/ دژبەیەك بۆ دیاردەیەکی تەبای/ جیاواز وەرچەرخێن. دواجارس سڵاوی بەیادهێنانەوە لە جەستەی ڕەشەکوژیکراوی ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریداو نووسەرە جوامێرەکەی بکەین..

**سەرچاوە**

**گۆڤاری ڕەهەند/ ژمارە** (12، 13).







ئینسانی خاوەن هۆش و عەقڵ و دڵ نەك بۆ ئیسنانی چەپەڵ و داوێن پیس و دوور لە هەموو زانیارییەك وەك جەنابت و غەیری جەنابت.

هەی جاهیلی بێئاگا زانایانی ئیسلام خزمەتی زۆریان کردووە، تۆ هەروا دابەیت (چوارپێ) سادەی ڕەنگە لە ئیسلام تێنەگەیشبیت. هەی جاهل، هەی نەفام، هەی سەرلێشێواوو بێ ئاگا لە هەموو شتێك، تۆ ئیمڕۆ چۆن بەم بێشەرمیەوە ئەڵێیت قورئان پەیوەندی نییە بە زانیاری ئەمڕۆوە زانایانی ئیسلام گەیشتنە ئەوەی کە هەندێ ڕەسەدو مەسەد دابنێین بۆ کەشفی ئەستێرەکانی ئاسمان. جاهیلێکی تەتەروفی نەزان، بە کرێگیراوو چڵکاوخۆرێکی وەکو (نووسەری) مەسەلەی کوردەواری ئەڵێ دەنگی دەهۆڵ لە دوورەوە خۆشە، هەر بەبێ ئەوەی لە ئەوروپا شارەزابێ، نە علومی ئیسلام شارەزابێ، نە لە مێژووی ئیسلام شارەزابێ، نە لە مێژووی ئەوروپاش هیچ بزانێ، کتێبێك پڕبکات لە خورافات و بە تەعبیرێکی ناشیرین و ناڕێك بیخاتە بازاڕەوە.

# چەند دێڕێک لە وتاری مەلا ئەحمەدی مستەفا ئاغای هەڵشۆیی

هەندێ بەکرێگیراوو سەرلێشێواو نۆکەری جولەکەو داعی صەلیبیەت هەڵئەستن بەم کارە نازانین بۆ نموونە یەکێ لەوانە کتێبێکی خستۆتە بازاڕەوە بە ناوی ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواری‌دا لەسەر نەهجی تیراژی موستەشرقین ئەم کتێبەی نوسیوە، موستەشرقین تەحەدای خوا ئەکەن و دوژمنانی دینی ئیسلام و زانایانی ئیسلامن.

ئەم کابرایە شتێکی نووسیووە بەو ناونیشانەی کە وتمان، لە هەندێ شوێندا باسی ئیسلام ئەکات و تەعریفی ئەدا بەڵام بە شێوەیەکی ناشیرین و لە قاڵبێکی سەقافیو عیلمی‌دا نا، لە هەندێ شوێندا شوبهات و گومانی فڕی ئەدات بۆ ئەوەی شەك و گومان فڕێدا لەناو گەنج و لاوەکاندا ئەوەی کە نووسراوەکانی ئیسلام و نووسەرە ڕاستەقینەکان یان واعیزو خەتیبەکان پێیان ئەڵێن وانیە.

من لە ئەساسدا ئەم کابرایە ئەناسم کە بێدینترین ئینسان و کافرترین ئینسانە بەڵام لێرەدا ڕووی تێئەکەین و پێی ئەڵێم ئەگەر شارەزایی نیە لە مێژووی ئیسلام و مێژووی عیلم و مێژووی نەهزەی ئەوروپا با دەمی خۆی لێنەکووتێت..

دروستکردنی ئەرزو ئاسمان، جیاوازی شەوو ڕۆژ با بزانێت لە نیشانەی ڕەوشی ڕوناکن لەسەر گەورەییو دەسەڵاتداریەتی خوا بەڵام بۆ کێ؟ بۆ

هەی جاهیل بێئاگا لە ئیسلام کاتێك شۆڕشی نەزانین و جاهیلیەتی ئۆکتۆبەر هێرشی کردە سەر بوخارا (360) مەدرەسەی وەکو جامعەی ئەزهەر لە بوخارا هەبوو.. بە دەستی ئەو جاهیلانە هەمووی تیاچوو.

جارێکی تر بە نووسەر ئەڵێین تۆ ئەگەر دڵسۆزی میللەتی توخوا ئەمڕۆ موشکیلەی تۆ ئەوەیە بچی بەگژ ئیسلامدا، ئیسلام چی لەتۆ کردووە؟ هەی بێئەدەب بەرامبەر بە پێغەمبەر..

پاشان لە درێژەی وتارەکەیدا دەڵێ:

چۆن چۆن ئەمڕۆکە بە ئیسلام ئەوەڕیت هەی بەکرێگیراوی کافر.

لە کۆتاییدا دەڵێ: هەی سەخیف! بەمەش کۆتایی بە خوتبەکەی دێنێ کە هەر هەمووی باسی کاریگەری ئیسلام دەکا لە جیهانداو لە بوارە جیاوازەکانی ژیانی سەردەمدا.

**تێبینی:**

شایانی گوتنە مەلا ئەحمەد چەند گوتارێکی نوێژی هەینی لە مزگەوتی خانەقای مەولانا تەرخان کرد دژی کتێبی (ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا).
ئەم چەند دێڕ لە گوتارێکی ڕۆژی هەینی ساڵی 1985 وەرگیراوە.

ڕۆڤار

لەم ڕۆژانەدا نامیلکەیەکم بڵاوکردەوە دەربارەی ژن و پیاو لە ڕوانگەی ئیسلامەوەو بە ناوی "ئادەمیزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا" کە ڕەتکردنەوەی قسەی هەندێ کەسی بیروباوەڕ لاوازی نەشارەزا لە ئیسلامە بە پێی بۆچوون و لێکۆڵینەوەی خۆم هەندێ ئایەت و حەدیس و گوفتارو ڕەفتاری پێغەمبەری ئیسلام (د.خ) و ڕای ئیمامی شافیعی کە سەر مەزهەبی زۆربەی زۆری کوردانە کردوومن بە بەڵگە بۆ قسەکانی خۆم. هەڵبەتە هەموو ئایەتەکان ژمارەی ئایەت و سورەتەکانم دەستنیشان کردووە مەگەر ژمارەی ئایەتێك بە هەڵەی چاپ گۆڕا بێ یان حەرفێ یا کەلیمەیەك ئەویش بە گەڕانەوەی سەر قورئانی پیرۆزو حەدیسەکانی خوێنەر دەتوانێ ڕاستییەکان دیاری بکرێ. لە کاتێکدا لە وەرگێڕاندا هەڵە نیە چۆنە ئاوا وەرگێڕدراوەتە سەر کوردی بێ کەم و زیاد. زۆر ڕون و ئاشکرایە کە لەم ڕووەوە ئاینی ئیسلام چ حوکم و دەستورێکی داناوە. منیش بە تەنها ئەو حوکمانەم بە کوردی نوسیوەتەوەو ڕای خۆمی تێدانیە ئیدی ئەم هێرشە لە لایەن هەندێ بەناو مەلاو نەخوێندەوارەوە کە لە کتێبەکەم نەگەیشتوون چونکە من نووسیومە قورئانی پیرۆز دەستورێکە خوا ناردوویە بۆ ئەوەی جێبەجێ بکرێ‌و حوکمی پێبکرێ‌و هەرکەسێ حوکمی پێنەکا دیارە دوورە لە ئیسلام.

ئەوجار ئەم حوکم و دەستورانە بۆ نێوان خەڵك و کۆمەڵە لە لایەك، لە لایەکی تر بۆ نێوان ئادەمیزادو خودایەو قورئان پیشەسازی‌و کشتوکاڵی تێدانیەو خوا پیشەسازی‌و کشتوکاڵ و تەکنەلۆژی خستۆتە سەر ملی خەڵك خۆیان.

ئەمە مانای ئەوە نیە کە قورئانی پیرۆز یان پێغەمبەر (د.خ) هانی خەڵکی نەداوە بۆ فێربوون، بەڵێ ئەم هاندانە هەیە بەڵام وەك بڵێ پێوانەکانی زانستی و ڕێگەکانی لە ئایەتەکانی قورئان بەدیناکرێ‌و گوتەی (بخوێنەو قەڵەم و فێری ئادەمیزادمان کرد ئەوەی نایزانی. ئەمانە هیچیان بەسەر پێوانەکان و لێکدانەوەکانی زانستی نین ئەوەی مامۆستاش دەیفەرموێ لە زاناکانی ئیسلام وەك ئیبن سیناو فارابی و هیتر ئەو مامۆستایە نافەرموێ بۆ موسوڵمانان ڕوونبکاتەوە ئەو زانستەیان لە کام ئایەت وەرگرتووە؟ ئەوجار ئەو زانایانە جگە لەوەی کە پاش وەرگیران لە یۆنانی وە دەستیان بە لێکۆڵینەوەی ئەم زانستانە کردوە ئەوە بۆچی پێشتر ئەو زانستانەیان نەهێنایە بەرهەم جگە لەمانە خودی پێغمبەر (د.خ) کە قورئانەکە بۆ وی هاتووە بۆ شتێکی وای بۆ موسوڵمانان نەدرکاندو بۆ لە کاتی پێغمبەر شتێکی وەهایان نەگوت نەیاندەزانی؟ تێی نەدەگەیشتن؟ ئەگەر مامۆستا دەڵی سەردەم هی ئەوە نەبوو ئەدی سەردەمی زاناکان هی

# وەڵامی عەبدولخالق مەعروف لەسەر خوتبەکەی مەلا ئەحمەد

ئەوە بوو؟ ئەوجار وەك من نوسیومە خوای گەورە سەردەم و زەمانەی لا نیە چونکە هەرچی حەزبکا دەیکاو خەڵکەکەی زەمینەی ئامادە دەکرد بۆ ئەو زانستانە.

ئەوجار ئایەت وەك باسی حوکمەکان دەکا وەك بۆ دەستوورو ڕێگەی خۆ پاککردن و دەستنوێژگرتن بە تۆز کە ئاو نەبێ دەفەرنوێ (یا ایها الذین آمنوا لا تؤتوا الصلوة و انتم سکاری حتی تعلموا ما تقولون و لا جنبا الا عابر سبیل حتی تغتسلوا و ان کنتم مرضی او علی سفر او جاء احد منکم من الغائط او لمستم النساء فلم تجدوا ماء فتیمموا صعیدا طیبا فامسحوا بوجوهکم و ایدیکم ان الله کان عفوا غفورا). سورەتی ئەلنیساء ئایەتی (43) واتە "ئەی ئەوانەی بڕواتان هەیە، بە سەرخۆشی نزیك نوێژی مەکەون تا دەزانن چ دەڵێن هەروا بە لەشی پیس مەگەر تەنها تێپەڕبوون بی تا خۆتان دەشۆن. ئەگەر نەخۆش بوون یان لە ڕێگادا بوون یان یەکێکتان پیشاوتان هات یان دەستتان بە ژنان کەوت -لە گەڵیاندا نوستن- و ئاوتان چنگ نەکەوت، بە گڵێکی پاك خۆ



پاککەنەوە بە دەست پێداهێنانی دەست و دەموچاوتان (ڕووتان) ئاوا دەبێ باسکردن جارێکی تریش ئەم ئایەتە لە سورەتی ئەلمائیدە بە هەمان واتا هاتوە ئایەتی (6). هەروا لە باسی خواردەمەنیدا دەڵێ انما حرم علیکم المیتە و الدم و الخنزیر و ما اهل بە لغیر الله فمن اضطر غیر باغ ولا عار فلا انم علیە ان الله غفور رحیم) ئایەتی (173) سورەتی ئەلبەقەرە.

واتە قەدەغەیە لە ئێوە خواردنی کەلاك و خوێن و گۆشتی بەرازو ئەوەی بۆ خوا سەرنەبڕابێ کەسێکی ناچار بووبێ دەستدرێژیو چاوشکاندن گوناحی ناگات و خواش بەخشندەو بە بەزەییە. باسکردن ئاوا دەبێ ئەگەر باسی کارەبا یا ئەتۆم یا میکانیکی کردبا دەبوو وەك پێوانەکانی هەن بەلای کەم و نزیك ئەوان با ئەوجار ئەم هەموو سەدەیە ڕەت بوو ئەوە بۆچی مەلایەکی خۆمان ڕۆژێك باسێکی وەهای نەکرد و بڵێ فڵانە ئایەت نیشانەی تەلەفزیۆنی ڕەنگییە با بالاخ وا دروست دەبێ پاش ئەمانە هەموو من تێناگەم ئەگەر قورئان باسی تەکنەلۆجیای تێدا نەبێ چ شەرم و عەیبی تێدایە؟ ئەوجار ئەو مەلایە دەڵێ ئایەتەکانی پچڕپچڕ هێناوە. کە نیو ئایەت لە سورەتێکەو نیوەکەی تر لە سورەتێکی ترە" ئەمە وانیە چونکە ژمارەی ئەیەت و ناوی سورەتەکانم نوسیوە یا خوێنەران بگەڕێنەوە سەری. دیسان مەلا دەڵێ عەبدولخالق داوێن پیسە.. خۆزگەم لەگەڵ مامۆستا لە وڵاتێکدا دەباین کە بە تەواوی بێ کەم و زیاد حوکمی قورئان جێبەجی دەکرا جا دەمدیت مامۆستا لەسەر ئەم قسەیە دەبوو یان چوار شاهید بێنێ کە منیان دیبێ لە حاڵێکدا وەك کلچوك لە کلدانیدا دەنا هەشتا داری دەخوارد لەبەر ئەو مینبەرەی ئەو قسەی فەرمووەو لەبەرچاوی ئەم کەسانەش کە بیستەری بوون و بە پێی ئایەتی (4) سورەتی ئەلنور کە دەڵێ (و الذین یرمون المحصنات ثم لم یاتوا باربعة شهداء فاجلدوهم ثمانین جلدة و لا تقبلوا لم شهادة ابدا اولئك هم الفاسقون) یان دەبوو بە پێی ئایەتی 6 سورەتی ئەلنور کە دەڵێ (والذین یرمون ازواجهم و لم یکن لهم شهداء الا انفسهم فشهادة احدهم اربع شهادات بالله انە لمن لصادقین) ڕەفتاری دەگەڵدا کرابا سورەتی ئەلئەنعام 59 (و عند مفاتح الغیب لا یعلمها الا هو و یعلم مافی البر و البحر و ما تسقط فی ورقة الا یعلمها و لاحبة فی ظلمات الارض ولا رطب و لا یابس الا فی کتاب مبین".

دەبوو بنوسراباوە. چونکە تەنها ناوبردنی ئەتۆم یا شتێکی تر ناکاتە باسکردن و زانستەکە چونکە ئەو زەریەکە کە پیشان پێی دەگوترا بەشی دابەشکردنی هەڵنەگر "جزء لا یتجزأ" پێش ئیسلام هەر هەبووە و کەسیش ناڵی ئەرستۆ یان ئەفلاتون یا فلانە کەس ئەتۆمی زانیوە یا باسی کردوە. ئەم مەسەلەیە وەك ئەوەیە کە لە ساڵانی 58–59 شۆڕەوی ئەستێرە دەستکردەکەی ناردە ئاسمان مامۆستا خالص لە کازمیە گوتی جا ئەمە چیە بە ئیسلام پێش هەزارو چەند سەدە ئەمەی کردووە ئەوە نیە خوا لە قورئاندا دەفەرموێ (سبحان الذی اسری بعبدە لیلا من المسجد الاقصی الخ) و هەندێك لەو مەلایانەی وەك مامۆستای خۆمان کەوا دەزانن ئەگەر شتێك لە قورئاندا نەبێ ئەمە ئیسپاتی نەزانی خودایە (خوایە بمانپارێزەو ئاینەکە پووچ دەردەچێ ئەوجار ئەویش نە لەبەر خوداو ئاینەکە بەڵکو لەبەر نانەکە تا ڕادەیەکیش ناهەقی نیە چونکە دنیا ململانێیمانە) "تنازع البقاء" مەلاش دەیەوێ وەك هەریەکێ بژی بە خۆشی ئەوجار هەندێگ گوتیان ئەوەی بڵێ چونەتە ناو مانگ کافر دەبێ، هەندێکی تر دڵی خۆیان بەوە داوە کە بابە قورئانیش باسیکردووە کە دەفەرموێ "لا تنفذوە الا بسلطان" سوڵتانەکەش هێزی ڕاکیتەکەیە سوپاس بۆ خوا ئەنجا ئەو خەڵکە نەجاتی بوو لەو کراسی کوفر دادڕێنەی ئەو جۆرە مەلایانە. جا من لە کەلیمەکەمدا هیچ ڕایەکم دەرنەبڕیوە نە بەرامبەر قورئان و نە حەدیس و نە ڕای ئیمامی شافیعی تەنها دەقەکانم هێناون و وەرمگێڕاونەتە کوردی بە بەڵگەی ئەو ڕەفتارانەی لەگەڵ ژندا دەکرێ ئیدی مەلا بە چ هەقێکی ئیسلامی ئەگەر ڕاست دەکا موسوڵمانە من بە کافرو داوێن پیسیو هتد دادەنێ ئەدی بۆ ئەگەر ڕاست دەکا لەسەر دین سوورە بۆچی باسی دوکتۆر ئەحمەد سوسە ناکا کە لە کتێبەکەی خۆیدا کە وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراق بلاوی‌کردۆتەوەو مودیری ڕاگەیاندن پێشەکیەکی ئەوتۆی بۆ نوسیوە هەر باسی ناکرێو کتێبەکەش بەناوی "العرب و الیهود فی التأریخ"ە کە لە هەموو کتێبەکەو بە تایبەت فەسلی چوارەم هەموو ئەو حیکایەتانەی لە تەورات هاتوون و لە قورئانیشدا هاتووە بە درۆ دەخاتەوەو ناویان بە ئوستورە دەبا باس لێوەناکا یان وەکو هەمیشە ئەمە دابی هەندێ مەلا بووە لە ئەوەی دەسەڵاتدارو پارەدار بیکا قەیناکاو سێبەری خوان لەسەر زەوی بەڵام زانایەك یا نوسەرێك ئەگەر واشنەبێ ئەگەر دینەکە وەك هەیە روونی کاتەوە کافرەو لە دین بەدەرە. ئەمە دەبێ چەندی بە چەندبێ.

ئینجا هەر من نەمگوتوە وەك ئیسپاتیشە قورئان باسی عیلمی نەکردووە چونکە قورئان ڕێڕەوێکی ئاینیو ڕەوشتی کۆمەڵە لە نێوان کۆمەڵ خۆیان و لە نێوان کۆمەڵ و خودا وەك لە کتێبەکەدا باسمکردووە کارێکی شتی تر عیلم پیشەسازیو کشتوکاڵ بە

خودی کۆمەڵە. خودا دەیانزانێ بوون و نەبوونیان وەک من لە کتێبەکەم ڕونمکردوونەتەوە چونکە خودا لە ئەزەلەوە تا ئەبەد هەموو شتێکی لا ڕوون و ئاشکرایە وەک ئایەتی 59 لە سورەتی ئەلئەنعامدا دەڵێ (و عنده مفاتیح الغیب لا یعلمها الا هو و یعلم ما فی البر و البحر و ما تسقط من ورقه الا یعلمها و لاحبة فی ظلمات الارض و لا رطب و لا یابس الا فی کتاب مبین) بەڵام لە قورئاندا باسی چۆنیەتی نەکردووە و مامۆستا عەباس مەحمود عەقادیش پێش من بە 15 ساڵ ئەم قسەیەی گوتووە کە لە کتابولهیلالی ساڵی 1970 ژمارە 229 لەژێر سەردێری الفلسفة القرآنیةدا لە پەردەی یەکەم بە ناوی "القرآن و العلم" کە دەڵێ "لە کتێبە بڕواییەکان داوا ناکرێ کە لەگەڵ عیلم یەک بگرنەوە کە هەر شتێك بۆ نەوەیەك دەرکەوت هەرواش داوا ناکرێ لەو کەسانەی بڕوایان بە کتێبە ئاینییەکان هەیە باسی ئەو زانستانە و پێوانەکانی بە درێژی بکەن. چونکە ئەم ڕونکردنەوانە دەوەستێتە سەر هەوڵو تەقەلای مرۆڤ.

زۆر بە هەڵەچوونە ئەو کەسانەی لەم دواییەدا گوتیان زەوی ناسوڕێ پشت بە تێگەیشتنی خۆیان هەندێ وتەی ئایەت. و پاش ئەوانیش هەندێکی تر وەک هەڵەی ئەوان هەڵەیان کرد کە تەفسیری "السموات السبع"یان بە کۆمەڵەی ڕۆژ کرد پاشان دەرکەوتن کە دەن و حەوت نین) هەر کەسێکیش دەتوانێ بچێت بە درێژی ئەم مەوزوعە بخوێنێتەوە ئەوەش بزانین کە ئەزهەر جێگەی مەلا گەورەکانی ئیسلامە تا ئێستاش کەسێك ئەم قسەیەی ڕەتنەکردۆتەوەو بە کافریشیان دانەناو مامۆستا عباسیش وەك لێی دەزاندرێ پیاوێکی خاوەن بیروباوەڕێکی ئیسلامی بووەو بەرەوانی ئیشی لە ئیسلام کردووەو هەر ئەم کتێبەی "الفلسفة القرآنیة" بەڵگەیەکی گەوری ترە،.

ئیدی مەلا هەی خودا بە کردەوەی خۆت لەگەڵدا بکا" جا کە من خوێنڕێژم کە دەڵێ بە دەنگی خۆت داوێن پیس و خوێنڕێژە من خوێن ڕێژم یان ئەو کەسانەی بە پارەو لای موستەفا ئاغای وەلاشی دەبنە فورسان و دوایش بۆ کارەکەی خۆیان دڵسۆز نابن و تفەنگەکەش دەفرێنن و دەیفرۆشن و ئینجا دەبنە فەقێ و دوایش خەتیب و مەلا "خوایە لێیان نەگری" ڕەنگە لەوێشدا فورسانێکی تر بن. ئەوجار بە ناوی دین دێن تانەو تۆمەت بۆ خەڵك هەڵدەبەستن.

خۆی ساڵانی 962-963 فورسانی موستەفا ئاغای وەلاشێ بووە لە ڕەواندوزو دوایی ڕایکردووە بۆ ناوچەی باڵەکایەتی کە دەسەڵاتی میری لێنەبووە و تفەنگەکەی فرۆشتووە و بووەتە فەقێ یەک دوو ساڵ خوێندویە تا بەمجۆرە. کاك حەسەن ئاغای محمد ئەمین ناوپردانی- چۆمان و خەڵکەکەی ئەوێش و مەی خەلان شاهیدی ئەم قسەن و ئەم قسەیە کاك حسن ئاغا لە خزمەت مامۆستا مەلا مجیدی گویری مزگەوتی بکر- گێڕایەوە. ئیدی هەزار حەیف مخابن کە مەلا دەیەوێ وەك پاتوخۆرەکانی من باسم کردون دین لەگەڵ سەردەم زەمانە بگونجێنێو خەڵکی هەژارو ڕەش و ڕووت فریو بداو دەستخەڕۆیان بکا. خۆیشی ئاوایە گورگە لە پێستی مەڕو بە پێی شەرعیش کەسێك کەسێ بەبێ بەڵگە کافر بکا خۆی کافرەو ئایەتیش دەڵێ "یا ایها الذین امنوا اذا ضربتم فی سبیل الله فتبینوا و لا تقولوا لمن القی الیکم السلام لست مؤمنا تبتغون عرض الحیوة الدنیا فعند الله مغانم کثیرة کذلك کنتم من قبل فمن الله علیکم فتبینوا ان الله بما تعلمون خبیر. ئایەتی (94) سورەتی النیساء.

قورئان و شەرعی ئیسلام دەبێ حەددییان لێدەربکرێ.

ئیمە بۆچوونی خۆمان ڕوونکردەوە کە قورئان پیشەسازی تێدانیە ئەوجار مەلا دێ دەڵی ئیسلام ژن و منداڵی نەکوشتوە، منیش لەم بارەیەوە نەمگوتوە ژن و منداڵی کوشتوە من هەر هیچم نەگوتوە ئایەت و حەدیس دەڵێن و منیش وەرمگێڕاوەتە سەر کوردی کە دەڵێ ژنان و منداڵ بە دیل دەگیرێن و دەکرێن و دەفرۆشرێن وەك هەر کوتاڵێك. پێویست بە دوپاتکردنەوەی ئایەت و حەدیسەکان ناکا بەڵام لێرە من دەڵێم با مامۆستا و ئەو مامۆستایانەی گرێیان لە دڵە با بگەڕێنەوە سەر مەزهەبی شافیعی کە مەزهەبی شافیعی ئەگەر حوکمی ئیسلامی لەسەر کاربێ جێبەجێ دەکرێ بەبێ کەم و زیادی و مەکانی کوردستان لە دروستبوونی مەلایەتی تا ئەمڕۆش لە لادێو شارەکانی کە ناچنە مەحکەمەی میری ئەم بەندو دەستورانەی لە مەزهەبی شافیعی هاتوون جێبەجێ دەکەن جا با بزانین لەم مەسەلەیەدا ئیمامی شافیعی چی دەڵێ (لە جیهاددا دروست نیە منداڵ و شێت و ژن و نێرەموکی موشکیل بکوژرێ تەنها لە چەند مەسئلەیەك نەبێ)

یەکەم: ئەگەر یەکێك ناچاربوو (مضطر) و کەسی تری چنگ نەکەوت ئەوکاتە بۆی هەیە بیانکوژێو بیانخوا بەلای ڕاست "لاپەڕە 222 مغنی المحتاج"

دووەم: ئەگەر شەڕیانکرد ئەوکاتە دەکوژرێن.

سێهەم: کاتێ پێویست بوو وەك کە ئەگەر کافران ئەوانیان کردە لەمپەر وەك لە دواییدا دێ.

چوارەم: ئەگەر ژنەکان لە نەتەوەیەك بوون پێغەمبەریان نەبووە وەك دەهرییەکان و بتپەرستان و نەبوونە ئیسلام.

پێنجەم: ئەگەر نێرەمووك یان ژن جوێنێ بە ئیسلام و موسوڵمانان دا دیسان دەكوژرێن، منداڵێكی هەرزەكار- كە مووی زبری لە بەری هاتبێ دەكوژرێ چونكە موی زبر نیشانەی خۆناسینە.

عەتیەی قەورەزی دەگێڕێتەوە (یەكێك بووم لە گیراوەكانی بەنی قورەیزە دیتم تەماشای مووی بەریان دەكرد ئەوەی مووی هاتبایە دەیانكوشت و ئەوەی مووی نەهاتبایە دەیانهێشتەوەو تەماشا بەری منیان كرد دیتیان نەهاتووەو كردمیانە تالانی و دیل) ئەم قسەیە ئیبن حەببان و حاكیم و تورموزی دەیگێڕنەوە.

بەڵام دروستە كوشتنی ڕاهیب و بەكرێگیراوو پیرو كوێر لە پێكەوتوو و دەست و پێبڕاو هەرچەندە لە ڕیزی شەڕكەرانیشدا نەبن لە بەر تێكڕای ئایەت كە دەڵێ (اقتلوا المشركين) و لەبەر ئەوەی ئازادن و خۆناسیشن بۆیە دروستە كوشتنیان.

جا ئەوانەی ناوبران ئەگەر لە شەڕدا گیران دەكرێن بە كۆیلەو ژن و منداڵ و شێتەكان وماڵیشیان بە تالان دەبرێ (سبی))

ئیدی برا من قسەیەكی زیادم نەكردووە ئەو شەرع دەفەرموێ هەی جاهیل ئێستاكێ جاهیل و نەزانە بچۆ فیقهە بخوێنە دینەكەت فێربە بەخەیاڵ دین دروست مەكەو ئەمە واقیعە جا ئەگەر ئەمەت پێناخۆشەو یان پێتوایە خەڵك لە دین دەتەكێتەوە ئەمە واقیعەكەیە من چی بكەم. ئەگەر ڕاست دەكەن فەرموون لەگەڵ خواست ویستی خەڵكی كە لەگەڵ ئایین دەگونجێ پشتگیری بكەن جا بزانن خەڵك لەگەڵتان دەبێ یان لێتان دەتەكێتەوە ئەوجار كارێكی كە قورئان و حەدیس و ڕای ئیمام مەزهەبەكان بن من بیخەمە ڕوو بۆ گوناح و تاوانە. ئەدی هەر بەمە حوكم نەكراوە بۆچی شەرمتان لێدێ.

ئەوجار ئەم هەموو گوناحە دەدەیە پاڵ من دەبێ خۆت لەگەڵ مندا بووبی دەنا لە كوێ دەزانی من ئاوام وەكو ئەو شاهیدە عەدلانەی پێویست ئێوە دینتان وەك تەلیسم گرتووەو بە دڵی خۆتان چۆنتان بوێ وای بادەدەن وەك گۆرانی فۆلكلۆری كە دەڵێ سیمەكەی بە دەست خۆمە چۆنی بادەی وای دینێ. ئینجا دەڵێ (فارابی) زانای موسیقا بووە و مامۆستای مۆسیقا بووە و ئاوازەكانی داناوە دەشی ئەم زانایانە هەموو قوتابی پێغەمبەر (د.خ) بوون باشە مەلا ئەمەیان چۆن جێ دەكاتەوە. كە مۆسیقا لە ئیسلامدا حەرامە وەك مەزهەبی شافیعی دەڵێ لە شەرحە مینهاج لە باسی كتاب البيع دا دەڵێ (هەر وا فرۆشتنی ئامرازو ئامێری ڕابواردن و خۆ لە بیركردن مۆسیقا وەك تەنبوور و چەنگ و زوڕنا و ڕەبابە و عوود درووست نیە فرۆشتنیان وەك بت و صورەت و سەگ و ئارەق) لەبەرئەوەی حەرامن جا چۆن مامۆستا وا دەزانێ؟.



# یادی شەهیدکردنی عەبدولخالق مەعروف سالّی 1992 لە هەولێر

**مەلا مەجید گوێری (مەلای مزگەوتی موفتی لە هەولێر)**

ی من لەگەڵ کاك عەبدولخالق مەعروف دەگەڕێینەوە بۆ
ساڵی 1955 لە بەغدا، هەرچەندە جێگەمان جیاواز بوو بەڵام دائیم
یەکەوە بووین. ئەو پیاوە (یانی کوڕە زۆر حەزدەکەم پێی
ڕ چونکە پێم خۆشە لە بەرچاودا هەر گەنج بێ). خاوەنی
اوەڕێکی زۆر زۆر پاك بوو. ئیمانی بە میللەتی خۆی هەبوو،
هیچ ئەبد دڕێنی نەبوو لە کوردایەتیدا، هەردووکمان لە
ڕۆژگارێکی تاڵ و ناخۆش و سەخت پێکەوە بووین لە
بەغدا. کاك عەبدولخالق توانی بیروباوەڕی خۆی
پارێزێ تا دوا لەحزە لە ژیانی کە شەهید کرا،
عەبدولخالق خاوەنی فەلسەفەیەك بوو لە
ژیان زۆر جێی داخی گرنگ کۆمەڵ ئێمە
ی تەحەمولی ئەو فەلسەفەیەی نەکرد،
لسەفەی کوردایەتی بوو. لە خەیاڵە
ەو کتێبەی کە دایینا (3) نسخەی لە بۆ
من هێنا ڕۆژی دوایی هاتەوە شکوای
ەبوو ئەمنیش دڵخۆشیم وتم، هەموو
خاوەن بیروباوەڕێك بەرهەمەکانی
ەکرێ و موحازەرەی دەبێ، کۆمەڵ
ژێردەستی ئێمە فێری لە حەق لادان
کرایە ئێمە دەبێ تەحەمول بکەین،
ئێستاش دەبێ تەحەمول بکەی، هەندێ
ئاگاداری خۆت بە. وتی نازانم ئەو
هەرایەیان بۆ دروست کردووە من
خیلافی شەرعم نەگوتیە.
یش لەو قەناعەتەدام، میللەتی ئێمە
موفرەدی عەرەبی پێخۆشە، هەمان موفرەدە
بیە کوردییە بێئەدەبییە، بۆ نمونە
زۆری پێخۆشە بڵێ (قبلە) کە گوتت (ماچ)
ی ناخۆشە.
لە خەیاڵی کابرایەك هات خوتبەی دابوو بە
منی گوت ئەوەتا لە ئەخیری لاپەڕەی ئەو دەڵێ
بەهەشت خەیاڵییە، ئەمنیش شتەکەم خوێندەوە گوتم
ویژدانت هەبێت وەکو لا تقربوا الصلاة لێیەکە ئەو پیاوە
ئەوانەی پێیان خۆشە ئافرەت ئازادبکرێ ئایا ئامادەن ژن و
کچ و خوشکیان شەو سەعات 11 و 12ی شەو بێنەوە ماڵ
ل ئەوانە یان دەیانەوێ بە هەشتێکی خەیاڵاوی لە دنیا
ێیان دروست بکەن. وتم بۆ خاتری خوا ئەو کابرایە تووشی
ەو گیروگرفت مەکەن لە خۆڕایی.

لە کۆتایی وتەکەیدا مامۆستا مەلا مەجید دەڵێ:
جێی ئەسەف بوو ئەو مرۆڤە بە نرخەیان لەناوبرد بە
دەسیسەو تەگبیری دوژمنانی میللەتی کورد.

**مەلا ڕەسول**

*مامۆستای زانا و پایەبەرز لە ناحیەی ئەخلاق و عیلم و
شەرعەوە بە ڕاستی بێوێنەبوو.
*جارێکیان مامۆستا عەبدولخالق لەگەڵ مەلا سالّحی
مزوورم کەوتنە گفتوگۆ، ئەو زانایە فەرمووی:
مامۆستا مەلا ساڵح گۆشتی ئینسان لە ئازادا
ئایا دروستە بخورێ یانا؟ واتە کاتی زەروری
بوو شتی قەدەغەکراو دەکرێتە شایستە و
حەرام حەڵاڵ دەکرێت وتی وەڵاهی نازانم.
ئەو وتی بەڵێ دەبێ، ئەوەبوو مامۆستا
عەبدولخالق کتێبەکەی دەرهێناو
لاپەڕەکانی هەڵدایەوەو ئەوەی
پەیوەندی بەو مەسەلەیە بوو نووسی،
مەلا ساڵح (خوا عەفوی بکا) وتی اشهد
بیلا ڕاستە. هەزار ڕەحمەت لە گۆڕت
بێ شەهیدی نەمرو من لەبەر نەمانی
ئەو شەهیدە مەزنە خۆم بە مردوو
دەزانم!

**مامۆستا مەلا موحەمەد ئیسماعیل**

**(پەروەردەکار)**

دوای لەسەر ئەو کتێبەی شەهیدکرکە
بوو دوایی چاپی کردبوو، من بڕوام
وانیە لەسەر ئەو کتێبە شەهید کرابێ
ئەو کتێبە هیچی تێدانیە دژی دین بێ،
بەڵکو هەمووی ئایەت و حەدیس و
ڕاوبۆچوونی عولەمای فیقهە، ئەو هەندێکیانی
تەرجومە کردووەو مانای لێداوەتەوە. ئەو کتێبە
کرایە هەنجەت و بیانوویەك نەزان بە ناوی دین فریوو
درابوون ئەوەیان قۆستەوەو شەهیدیش خاوەن بیروباوەڕی قایم
بوو سەری بۆ ڕژێم شۆڕ نەدەکرد من وای بۆ دەچم کە حوکمی
ئیعدامی لەسەر بوو بەڵام جێبەجێ کردنەکەی دواخرابوو.
دوکانەکەی شەهید ببووە حەلقەی کوردایەتی و خەڵکی
زۆری لێکۆببووەوە ئەوەش بووە هۆی کوشتنی و من پێم وایە
حکومەتی بەغدا مەسئوولە لە کوشتنی.

ANNABA _ ALGERIE

١٩٨٤/٥/٧

بۆ برای خۆشەویستم کاک عەبدولخالیق پێشکێشە

ڕۆژتان باش

سڵاوێکی بێ پایانت پێشکێش دەکەم، چاوت ماچ دەکەم، دوو ڕۆژ لەمەوبەر نامەی ڕۆژی ٢٤/٤/١٩٨٤ و دیارییە بە نرخەکەت پێم گەیشت. سوپاس زۆریش سوپاس. دەڵێم دیارییە بە نرخەکەت نەوەکو لەبەر ئەوەی وەکو هەندێ کەس هەست دەکا گۆیا لە سەر من دەکەیەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی بە دەست و قەڵەمی تۆ نووسراوەتەوە و بەرهەمی تۆیە. ئەوەی ڕاستیشی بێ وەکو خۆت لە هەموو کەس باشتر دەیزانی من ئاگاداری تەفسیلاتی نووسینەکەت نەبووم، مەگەر لە دانیشتنەکانمان دا هەندێکم لێ گێڕابێتەوە پێش ئەوەی ببێ بە کتێب، لەبەر ئەوە من لە هەموو کەس زیاتر بە پەرۆشەوە بووم لەبەر دوو شت، یەکەمیان پێوەندی بە تۆوە هەیە، ئایا نووسینەکە لە پلەیێک دا دەبێ کە بەراستی بەرپەرچ بێ؟. دووەمیان پێوەندی بەمنەوە هەبوو، ئەویش لەبەر ئەوەی من تا ئێستا هەر چاویشم بە کتێبەکەی حەمە نەکەوتووە، جا ئەمە خەڵکی ناوی دەبێ چی ئارەزووی خۆیەتی، لەبەر ئەوە من بە پەرۆشەوە چاوەڕوان بووم بۆ ئەوەی لە ڕێگەی تۆوە بزانم حەمە چی بە من وتووە. پێش دیارییەکەی تۆ بە هەر حاڵ چەند دانەیێکی بۆ ناردم، ئیتر بەم جۆرە تۆ زۆر شتت بۆم ڕوون کردەوە کە ئەم کابرایە چی بە من کردووە. ئەمەیان گرنگ نییە، با ئێمە لە بنج و بناوان بکۆڵینەوە و هەندێ شتت بۆ ڕوون بکەمەوە. لەو ڕۆژەی من حەمەم ناسیوە ڕقی لە من بووە، ئەمە لە ساڵی ١٩٥٨ بوو لە کەرکووک، کە من دەورێکم هەبوو لە گۆواری "شەفەق"، ئەو کاتە فەقێ بوو و کەواو سەڵتەی لەبەر دەکرد، ئەمە پێش ئەوەی لە بەغدا بنیشێتەوە لە تەکیەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و گۆیا خۆشیان نەقشبەندین، نەیسە ئەمە گرنگ نییە، ویستی گیڕە شێعرێکی لە شەفەق دا بکا، بەڵام ڕێگەی نەدرا. هەر لەو ڕۆژگارە بوو کە من کەوتمە بەر بەرەکانێی حیزبی پێزەرچی یەتی، گفتوگۆ و چەندین چوونیشم لەگەڵ ئەوانا نەبوو، لەگەڵ مامۆستاما مەلا جەمیل دا بوو. ئیتر بەرەبەرەکانێی نێوان ئێمە لە حاجیەکی سایکۆلۆجییەوە دەستی پێکرد. من خەریکی ئەدەبی کوردی بووم، باش و خراپ، زۆرم دەنووسی، ئەوانیش دیار بوو تازە دەستیان دەدایە و بە مەیلەوی دەستیان پێکرد، ئیتر کە لە ڕەقیبێکی وەکو من بووە منافسی. بۆ ئەمە هەر لەو ڕۆژەوە تیۆری پێکیان دانا، نووسینێکی ئەوەیە مێژوونووسی ئەدەبی دەبێ مەلا بێ، زانستگا و کۆلیجی ئەدەبیات و هەندەران کەڵکی نییە، جا بە ئینکیی وەکو من با هەر بقیرێنێ بڵێ یادکەم وەڵڵا پیاوی مەلام، لە نادەملایان گەورە بووم بنەماڵەی شێخ مەلای بەرزنجەی تر بە سیبانی خزمین، باپیری دایکم مەلایێکی گەورەی خۆشناوەتی بووە، ئەمە هەمووی کەڵکی نییە، ڕاستییەکەی خەتیاتت نەخواردبێ.

-٢-

تۆ لە من باشتر دەزانی سەرانسەری بیروڕاکانیان تەنێ لەو کتێبەدا، بەڵکو زۆر شتی تریش ـ ئەوەی حەمە دژی منی نووسیوە لە ڕۆژنامە و گۆوارەکان دا دوو ئەوەندەی کتێبەکەیەتی ـ هەمووی لە دەوری یەک شتە ئەوەی مەلا نەبێ ئەو کارەی بۆ هەڵنا سووڕێ کە من خەریکیم. ئیتر دەبینی ئەم پەردە سایکۆلۆجییە بە دەست یەکێکی وەک تۆوە بوو. بەڵێ تۆ ئەوروپا دیدەی، زمانی گاوورانیش دەزانی، هەروەستت لەگەڵ مەی و مەیخانە هەیە، بە حیسابی فاسقی، بەڵام تۆ بازیبەندی کاکە حەمەدی شێخت لە قۆڵ دایە، چونکە مەلای و ئەو عیلمەی ئەوان دەزانی و لە ئەزهەرەوە نزیکی، ئیتر من گومانم نییە کە پشتی حەمەت شکاندووە، هەموو تەلیسمەکانی بەتاڵ بوو و هەڵوەشایەوە. من نووسیکی ئەم قسانەم بۆ کاکە حەمەم نووسی. بەڵێ ڕاستە ئەگەر هەڵەی چاپی کەم بووایە باشتر بوو، ئیزاریش بکرایە ئەویش باشتر بوو، بەڵام ئەمە هیچ لە مەسەلە ناگۆڕێ، کە تۆ توانیت ڕووتیان بکەیتەوە، جا ئەگەر ئەمجا حەمە بیەوێ بە ڕەنگارت بێ، ئەوا دەبێ لە سووچێکی ترەوە بۆی بچێ، ئەمەش بەو هەڵنا سووڕێ، چونکە دۆزینەوەی مێتۆدێکی تر گەلێ قورسە، دیارە ئەو لە مێتۆدی موجرە ناتوانێ بچێتە دەرەوە. برادەرێک وتی: ئەم کارەی کاک عەبدولخالیق بۆ حەمە باش بوو، حەمە وا دەزانی فیرعەونە، بەڵام خودا مووسای بۆ نارد، ڕەنگە بترسێ و خۆی بناسێتەوە، هەرچەندە ئەمە بیروڕایێکی ساکارە بەڵام ڕاستی تێدا هەیە.

ئیتر باسەکەت نەبڕێنم و نامەوێ بچمە ناو ئەم باسانەوە لەمە زیاتر.

وا ساڵێکی خوێندن خەریکە تەواو دەبێ، بەڵام من زۆرم کرد و زۆریشم نووسی، حەزم دەکرد بگەڕێمەوە، بەڵام وادەردەکەوێ ساڵێکی خوێندنی تریش دەمێنمەوە، هەر چۆنێ بێ لەوە زیاتر ئیدارە ناکەم، چونکە بەڕاستی بیری نیشتمان و بیری ئێوە دەکەم، دانیشتنەکانی دوکان و یانە زۆر زۆر لە زانستگاکانی هەندەرانیش خۆشترە.

هەندێ چیرۆکی شەوق و شێری سێ سەد چوارسەد ساڵ لەمەوپێشم نووسیوەتەوە.

زۆربەی مێژووی ئەدەبی کوردیم تەواو کردووە، زیاتر شارەزاییم لە مێژووی ئەدەبی جیهانی "ئەڵمانی، فەرەنسی، ئینگلیزی، ئیتالی" پەیدا کردووە، بە هۆی ئەوەی ئەم دەرسە لە زانستگا دەڵێمەوە. گەیشتوومەتە گەلێ ڕاستی تازەی تریش لە بابەت ئەدەبییەوە. ئیتر هەروا وەختی زۆرە پیاو ئەگەر بیەوێ خزمەتی خۆی بکا.

سڵاوم پێشکێشی بە هەموو برادەرانی دوکان و یانە و ئەو دوورەکەی کاک نووری بکە. بەتایبەتی سڵاوم بۆ مامۆستا سەعید ناکام ئەگەر سەردانی، نوازشتی بۆ بکە پێی بڵێ بیبینە و بیری دەکەم، ئەو ڕۆژە لەگەڵ برادەرێک لە ئەوروپاوە بە تەلەفۆن دەدوام وتی: مامۆستا سەعید ووتوویەتی گوا یادکەم بە خودا کاک عەبدولخالیق هیچی بە حەمە نەکردووە، دەبێ مەمنوونی بێ. دیارە ئەم نوکتەیە لە مامۆستا سەعید دەوەشێتەوە.

دوو بارە سوپاس و چاوەڕوانی هەواڵتانم، بژی

[signature]

# هەندێ بەڵگەنامە

هەولێر ٧/٢/ ٩٨٤

بۆ مامۆستای گەورە و بەڕێزم کاک عومەر

سڵاو و ئیحترام هەرلێرە تادێ پڕ بە دڵ دەنێرم ئومێد دەکەم

هەمیشە لەشساغ و لە خۆشیدا بژی ، ئێمە هەرچۆنێک هەیە

رای دەبوێرین ، ئومێدە خۆشتریش بێ . زۆر جار لەگەڵ برادەران دەکەوم

یادتان بە خۆشییەوە دەکەین چەوادەتە هەر لەگەڵتاندا ژیاوین بە یەکیشی

دوور بێ ئومێد دەکەین لەم زووانە دا بە دیدارتان شاد بین

لە وڵاتی خۆماندا .

زۆر ڕێز و ئیحترام دەنوێنم بە ئاسەر ، بە مامۆستای گەورەمان مامۆستا

ئیبراهیم ئومێد دەکەم هەمیشە لە خۆشیدا بژی .

کاک مەحمود دەستی هەموو لایێکتان ماچ دەکا و خۆشەویستی هەیە .

مامۆستا لەگەڵ نامەی کاک نوری ئیسماعیل برادەرێکی خۆشەویستی ئێمەیە ئێستا

لەگەڵ نەخۆشێکی دۆستی ئێمە کاک محەمەد عەلی هاتوونە ئەوێ تکایە ئەگەر پێویستیان

بوو چی لە دەست دێ لە یارمەتی نەخۆشەکە و جێگایان سوپاسێکی بێ پایانە

وەک بیستم هەندێ سپاردەی کاک مەحمودی پێیە ئەگەر بۆتان کرا

دەنا هەر پشت گوێی بخەن

بیدی خۆشیتان بە ئەدیبەری تازە و زوانە

تێبینی
لێمان ببوورە تائێستا نەمانتوانیوە نامەتان

بۆ بنێرین .

برای بچووکتان
عبداللە ...

---

Annaba - ALGERIE

١٩٨٣ / ١٢ / ٣٠

بۆ برای خۆشەویستم کاک عەبدولخالیق پێشکەش

ڕۆژتان باش

نامە شیرینەکەی ڕۆژی ١٤/١١/ ١٩٨٣ دەمێکە پێم گەیشتووە ، لە لایێک لەبەر ئیشوکار ،

لە لایێکی تریشەوە چاوەڕووانی نامەی جەمالی برام بووم ، بۆیە کەوتە دووا ڕۆژانی ساڵی

١٩٨٣ . هەرچەندە ئەم نامەیە لە پاش سەری ساڵ پێتان دەگا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا

دەتوانم بڵێم جەژنی سەری ساڵتان پیرۆز بێ ، هیوا دارم جەژنێکی خۆشتان بر دبێتە

سەر و هەموو کاتێکتان جەژن بێ . جا حاڵ خەبەری بۆ ناردم کە کتێبەکەت لەگەڵ

تەواوبوونی ساڵ دەردەچێ ، دەبێ بەم زووانە پێم بگا ، ڕەنگە سوودی لێ وەربگرم ، چونکە

بە ڕاستی من ئەو کتێبەم نەخوێندۆتەوە کە تۆ لەسەری دەنووسی ، بە هۆی تۆوە من

دەزانم چی ووتووە .

کاکی خۆم ، خۆت خەریکی ترانزیستۆر و ئەلیکترۆن بکە باشترە ، زمانی ئێمە

پێویستی بەم جۆرە شتەشی هەیە ، ڕەنگە ئێستا ئەمەیان لە ئەویتریان گرنگ تر

بێ . یادداشتی نووسەرێکی میسریم خوێندەوە ، لێی دەپرسن ، ئەگەر جارێکی تر زیندوو

بیتەوە حەز دەکەی ببی بە نووسەر ؟ یەکسەر دەڵێ : نا ، چونکە هەموو ئەوکەسانەی

بە درێژایی ژیانم لە دژیان نووسیم ، لە نووسینەکانم نەگەیشتبوون ، لەبەر ئەوە

سەنعەتی باوکم هەڵدەبژێرم .

نامەیێکی تۆزێ ئەدەبیانەم بۆ کاکە مەم نووسی ، ڕەنگە پێی گەیشتبێ و چی ووت

پێی کەوتبێ . لێرە هەندێ شاعیری گەنجی باشی هەن ، جووان دەنووسن ، جووانیش

دەخوێننەوە ، لە یەکتریش تووڕە دەبن . وا بزانم چیرۆک نووسەکانیان لە شاعیریان

باشترن . سڵاوم بۆ هەموو دۆست و برادەرانی کوڕی دوکانەکەت و چێشتی کاری

نووری حاجی و کوڕی یانەکان ، بە تایبەتی یانەی ئازادی .

دوو بارە سڵاو لە هەموو لایێک دەکەمەوە بژین .

برات

دکتۆر عارف حەمزەدار

١٠/٤/١٩٩٥

كشف على الجثة

انتقلت الى غرفة الطبيب العدلي وصالة التشريح وجدت جثة تعود الى المدعو عبدالخالق معروف محمد امين وكانت الجثة موضوعة على طاولة التشريح وهو عاري عن الملابس وشاهدت فيه عدة عيارات نارية في الصفحة اليسرى من جسمه، وشاهدت اربعة ثقوب نتيجة الاطلاقات وهو بمتوسط البنية اسمر اللون اشيب الشعر وعليه ختم الكشف.

م. المحقق

---

مركز شرطة آزادي
١٠/٤/٩٥

كشف على محل الحادث

بناءً على الاخبار الوارد الينا حول حصول حادث قتل شخص في القريب من ثانوية النضال في آزادي قرب اتحاد النساء، عليه انتقلت الى محل الحادث واجريت الكشف الآتي

١- وجدت محل الحادث يبعد عن المركز حوالي ٢ كم وفي الشارع القريب من اتحاد نساء العراق وكان محل الحادث قرب ثانوية النضال في آزادي وبجانب سياج الثانوية القريب من الشارع.

٢- وجدت آثار دماء في محل الحادث ولم اجد المصاب
٤- وجدت قطعة قماش تشبه اليشماغ كان فيها دماء في محل الحادث

٥- وجدت ثلاثة ظروف اطلاقات قرب الصف تعود لبندقية كلاشنكوف.

٦- وجدت بعد الظروف عن موقع الدماء حوالي اربعة امتار. ووجدت مدخل اطلاقة في جدار المدرسة

٧- كان عرض الصف حوالي اربعة امتار.

٨- لم اجد شيئاً آخر يستوجب الذكر وعليه ختم الكشف.

م. المحقق




عەبدولخالق مەعروف



ناوەڕاست: عەبدولخالق مەعروف



عەبدولخالق مەعروف



مەزرای عەبدولخالق مەعروف



نوری نانەکەلی، کاکە مەم بۆتانی، عەبدولخالق مەعروف



ژمارەیەك لە نووسەران لەسەر گۆڕای عەبدولخالق مەعروف